

**تابلۆکانی بەرگ و ناوەوە:**

- هونەرمەند نامیق عەلی قادر ۱۹۹۰

# نووسەری نوێ


خاوەنی ئیمتیاز

مەهدی خۆشناو

سەرنووسەر

کەمال غەمبار

دەستەی نووسەران

ئەنوەر مەسیفی

د. عەبدوڵڵا حەداد

غازی حەسەن

عەباس عەبدوڵڵا یوسف

کاکل حەسەن - ئاسۆ

ژمارە 6 خولی دوای ڕاپەڕین
تشرینی دووەمی ١٩٩٨

گۆڤارێکی ئەدەبی مانگانەیە/ یەکێتی نووسەرانی کورد / لقی هەولێر دەری دەکات

**ناونیشان** : هەولێر ت: ٢٢٢٨٠

# پاسترناك

## کوڕی دڵسۆزی ڕووسیا



عارف خەزنەدار

(١)

### سپێدەی ژیانێکی نەمر

لە قۆناغی دوایی سەدەی نۆزدەم، سەر زەوییێکی یەکجار فرلوان و پانوپۆڕ، بەقەوارە گەورەترین دەوڵەتێکی سەر رووی زەوی، روسیایان پێ دەووت. لەو سەردەمەدا گیروگرفت و تەنگوچەڵەمەی زۆربەی دانیشتوانی ئەم سەر زەوییەی ئێمە لەوێ کۆ بوونەوە. لەپیشەسازیدا تا پلەیەك پێشکەوتوو، لەهونەرو ئەدەبدا تاقیکردنەوەی نەتەوەکانی ئەورووپایان کۆ کردبووەوە. ئەوپەڕی دەوڵەمەندی، نزمترین پلەی هەژاریو بێ نەوایی. لە مێژ نەبوو بەرەسمی کۆیلەی زەوی قەدەغە کرابوو، بەلاّم لە راستیشدا فرۆشتنی زەوی‌وزار بەجوتیارەکانیەوە لەلایەن خاوەن زەوییە دەوڵەمەندەکانەوە هێشتا کارێکی ئاسایی بوو. لەگەڵ ئەکادیمیە و زانستگەو دەسگا زانستی‌و ئەدەبی‌و هونەرییە زۆرەکان کە دروشمی پێشکەوتن و خوێندەواری بوون بەشی زۆری جوتیارو خەڵکی لادێ نەخوێندەوارو بێ سەواد بوون، چینێکی خوارەوەی بێ نرخ بوون، لە رووی یاساو نەریتی کۆمەلآیەتییەوە، تاکی ئەو

کۆمەڵەیان ناو نابوو (مووژیك) واتە بۆرە پیاوو کەسی نزم و بێ نرخ.

لــەم کۆمەڵــە ســەیرو پێشــکەوتووو دوواکـــەوتووەی لایێکـــی زۆری زەوی ئەوروپاو ئاسیای داگیر کردبوو لە رۆژی ١٠ی شـوباتی ١٨٩٠ لەشـاری مۆسـکۆ فرزەندێکـی گـەورەی دوولرۆژی ئـەدەبی رووســی لــەدایك بــوو، نــاوی بۆریــس لیۆنۆدۆڤیــچ پاســتیرناك بــوو. لـــەو رۆژگارەی نەوزادی تازە هاتە سەر رووی زەوی باوك و دایکـی لـەماڵێکی بچووکـی ســاکاری ســاختمانێکی نێــوان هــەردوو گــەڕەکی تڤــێر ســکایا - یاماســکاو ئۆروژاینی زیندەگانییان دەکرد. ئێسـتا ئـــەم خـــانووە نزیـــك گۆڕەپـــانی مایاکۆڤسکییە لەسـەر شـەقامی گۆرکـی. لـەدووا سـالانی سـەدەی نۆزدەمـدا ئـەم گەڕەکـە لەقــەراغ شــاربوو، ناوچــەیێکی قەڵـــەباڵغ وپـــڕ لـــەجموجۆڵی بـــوو، دانیشـــتووانی بـــەزۆری کۆڵهـــەڵگرو عــەربانچیو کرێکــاری رێگــەی ئاســن بوون.

لیۆنیـد پاسـتیرناك بـاوكی بلیمـەتی دووا رۆژی ئـــــەدەبی رووســـــی هونــەرەورێکی شــێوەکاری ناســراوی ســـەردەمی خـــۆی بـــوو، لەهـــەموو بابەتـــەکانی نیگارکێشـــی ســـەری دەردەچـــوو. هـــەرچی دایکیشـــی بـــوو رۆســـالیا ئیســـۆدۆرۆڤنا پاســـتیرناك (لەقەبی کچێنی پێش شووکردنی مالی بـاوکی کاوفمـان بـوو) مۆسـیقاژەنێکی هەڵکــەوتووی کۆمەڵــەی رووناکبــیرو خوێنــدەواری ئــەو ســەردەمەی شــاری مۆسکۆ بوو. یەکەمین بیرەوەری لە ژیانی رۆڵە بچووکەکەی لەسەر کۆشی دادەنێ لەکاتێ لەسەر پیانۆ دادەنیشێ و ئاوازی داهێــنراوی خــۆیو مۆســیقارە نــەمرە گــەورەکانی گێــتی دەکاتــە زاخــاوی مێشکی گوێگرە پڕ هەست و نەستەکان.

پاستیرناك چاوی لەماڵێك هەڵهێنا پڕ لە ئاوازو رەنگ. بەبێ ئەوەی هەست بکا، پێش ئەوەی خۆی بدۆزێتـەوەو پیشـەی دوولرۆژی دیاری بکا بوو بەنیگارکێشی شـێوەکارو مۆسیقاری هونەرمـەند، بـەلام لـەدووایيدا هـەولی دا مـەیدانی هونـەر فراوان بکاو بە شاعیری سەردەقی مۆری چارەنووسی پیشەی خۆی بشکێنێ.

بۆریـس لەگـەلْ ئـەوەی منـدالْ بـوو و هێشتا لەتەمەنی سێ سالیدا بوو، بەلام کۆمەڵــە بچووکەکــەی مالــەوەی وەك دیاردەیــەکی هونــەری بــەرزو لــەدایك بوونــی ئەلیکســاندەری بـرایو کۆمەڵـە گەورەکەی گەڕەکەکەیان لەهەلسوکەوتی چیــنی خــوارەوەی هــەژارو گیروگرفتــە زۆرەکانیـــان کـــارێکی گـــەورەیان لەبیرەوەهۆشــی کردبــوو. ئەمــە یەکــەمین

تنبیــــنی و یادگــــارو بــــیرەوەری یادکردنـەوەی بـوو لـەخۆی. لـەو کاتـەدا لیۆنیــــد پاســـتیرناکی بــــاوکی وەك مامۆســـتایێك لــە ئامۆژگــای هونـــەرو پەیکەرتەراشــیو بیناســازی لەمۆســکۆ دامــەزرا، بــەم هۆیــەوە لــەناو دەســگای ئامۆژگـــا، خـــانوویێکی بەرکـــەوت وەك جێگــەی ژیــان و ســتۆدیوی کــارکردنی وێنەکێشان، ئەمە لەپاییزی ساڵی ١٨٩٤ بوو. بـەخاوو خێزانـەوە باریـان کـرد بـۆ هەواری تازەیان.

ژیـانی مەڵبـەندی تـازە کاریگـەرێکی گیانی هەبوو لەسەر بنەماڵە، ژن و مێرد و بۆریسی بچووك. لیۆنیدی هونەرمـەند کەوتـە نێوەندێکـی زانسـتیو هونـەری بـەرز، هــەر لەدیمــەنی ئــەندازیاری بیناسازیو پارك و باغاتی ئامۆژگاکەوە بگرە تا چیمەن و باغچەکانی ناوەراستی شــەقامەکان لەگــەڕەکی میاســـنیتکایا ئەمانە بوونـە هـۆی تەقینـەوەی بـەهرەی داهێنانی هونەری، سەرچاوەیەکی گرنگ بوون بـۆ بەرهــەمی تـازەی سـەرکەوتوو. رۆســایلی دایکــی هەمیشــە گۆشــەی ژوورەکەی لەئاوازی مۆسیقاو ئاهەنگ و کونسێرت بێ بەش نەدەکرد، بەتایبەتی لەکاتێکدا کەڵە هونەرمەندو نووسەرانی ئـەو سـەردەمە میوانــی ئــەم دیوەخانــە بەروخســـار بچـــووك و بــــەناوەرۆك دەوڵەمــەندە دەبـوون، لەمانـە هـی وەکـو پۆلینــــۆف، ســــیرۆڤ، کاســــاتکین، تۆلســتۆی، ســــکریابین، ســـۆلۆڤێیڤ، فیــۆدۆرۆڤ و هــی تــر، بۆریــس لــەم قۆناغـەیژیانیدا هەستی بـەبوونی خـۆی کـرد، ئەمـە بـووە هـۆی دروسـت بوونــی خـەونێك لەمێشکی دا، دەبوو هـەوڵ بـدا خەونەکە لە ژیانی راستیدا بێتە دی.

## (٢)
## نێوەندێکی رۆشنبیری بەرز

سـەردەمی منداڵـی بۆریـس لـەبارەی رووداوی جۆربــــەجۆرەوە یــــەکجار دەوڵەمەند بوو، هەمیشە گوێی بەئاوازی مۆسـیقای دایکـی راهـات بـوو، چـاوی بەسـکێچ و بۆیـاغ و فلچـەکانی بـاوکی روون بوو بـووەوە، حیکایەتـەکانی ئـاکو لینـا گاڤریلۆڤنـاس دایـەنی خـەیاڵ و مێشکیان دەبزواند، هۆگری ئەم ژنە بوو. لەگـەڵی دەچووە کلیسـە، بیری لـەکردگار دەکـردەوەو گیــانی تێکــەڵ بــەو ئــاوازو گۆرانییانـە دەبـوو و دەیویسـت لـەخودا نزیــك ببێتـــەوە ئەلیکســـاندەری بـــرا بچووکی زۆر خۆشی دەویست، یارییـان دەکـرد، وێنـەیان دەکێشـا، مۆسـیقایان دەژەنی، گەمەی رۆژنامەگەرییان دەکرد، کۆواری ئەدەبییان دەنووسییەوە.

لەماڵی بۆریس منداڵ دوو زمانی رووسی و ئەڵمانی بەکار دەهێنرا، هەردووکیان لەیەك پلەدابوون، هیچ یەکێکیان بەسەر ئەویترباندا زاڵ نەبوو، هۆی ئەمە دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی لەبنجدا بنەماڵەی پاستیرناك لەدایك و باوکەوە بەنەژاد جوولەکە بوون، ئەمانە ئەگەر لەچینەکانی سەرەوە بوونایە لەرووی دەوڵەمەندی و خوێندەواری و روناکبیرییەوە بەزمانی ئەڵمانی لەماڵەوە قسەیان دەکرد، وەکو بنەماڵەی قەیسەرو میرو دەوڵەمەندانی چینی سەرەوە لەماڵەوە یا بەفەرنسی یا بەئەڵمانی لەگەڵ یەکتریدا دەدووان. لەبەر ئەوە سەرەتای خوێندنی بۆریس بەئەڵمانی بوو لەهەموو وانەکاندا.

گەورەترین رووداوێك لە ژیانی بۆریس ئەوە بوو لەشەرەف بەشداربوون لەسوپاو عەسکەری کردن بەدوور بوو. ئەمە بۆ هاوولاتی ئەو کاتەو هەموو سەردەمێك دەبێتە دروست بوونی گرێیەکی سایکۆلۆجی لەدڵی ئەو کەسەدا بەدرێژایی ژیانی. هۆی ئەم بێ بەش بوونە دەگەڕێتەوە بۆ رووداوی شکانی پێی بۆریس. وابوو پشووی حەسانەوەی ساڵی ١٩٠٣ی لەگوندی ئۆبۆلێنسکۆیێ دەبردە سەر. مێردمنداڵی دوازدە سێزدەساڵی لەگەشتێکیدا سواری ئەسپێك دەبێ، لەناکاو ولاغەکە بەرەڵلا دەبێ و دەست بەغار دەکاو بۆریس لەسەر ئەسپ دەکەوێتە خوارەوە، برینداربیەکەی لەمردن نزیکی دەکاتەوە، بەلام رزگاری دەبێ، ئەوەندە هەیە شکانی رانی دەبێتە هۆی شەلیو لەنگی بەدرێژایی ژیانی، ئیتر لەخزمەتی سوپاو عەسکەری دەبەخشرێ.

لەگەڵ ئەوەی حەسانەوەی ئەو هاوینەی پڕ لە ئێش و ئازار بوو بە هۆی برینداربیەوە، بەلام لەلایێکی ترەوە رۆژبەرۆژ تاقیکردنەوەی زیاتر دەبوو، هەر لەو گەشتەی دابوو مۆسیقاری گەورەی رووسی سکریابنی لەو گوندەدا دەحەسایەوە خەریکی دانانی سەمفۆنیای سێیەمی بوو. بۆریس گوێی لێ دەگرت، سەرنجی دەدایە هەموو قۆناغەکانی دانانی ئەم کارە هونەرییە بەرزە تا تەواو بوون. ئەم کردەوەیە کاری تێ کردبوو و بەهۆی بیرکردنەوەو خولیای هەمیشەیی لەلای قۆتابی بۆریس. ئەمەو سروشتی پڕ نهێنی قانگ دراو بەئەفسانەی ئەرزو ئاسمان و بەهەشت و دۆزەخ بوونە هۆی ئەوەی خوێندنی مۆسیقا ببێتە ئامانجی سەرەکی بۆریس. لەبەر ئەوە بوو لەگەڵ خوێندنی قوتابخانەی سەرەتایی

کۆرسی قوتابخانەی مۆسیقا (کونسێرڤاتۆر)یشی کۆتایی پێ هێنا. لەم سەردەمە ناسکەی ژیانیدا بۆریسی مێردمندالْ کەوتە سەرسامی و دوو دڵییەوە، بڕیاردان قورس بوو، لەناو پێچەکانی مێشکیدا مۆسیقاو شیعر لە چەندو چووندا بوون، لەرووی یەکترییەوە چووبوونە مەیدانەوە، خۆشی نەیدەزانی لەبەرچی وشە بەسەر ئاولزدا زالْ بوو، بڕیاری دا ولز لە مۆسیقا بهێنێ وەك پیشەییێك و خۆی بۆ داهێنانی ئەدەبی تەرخان بکا.

(٣)

## خوێندنی ئامادەیی و زانستگا

لاوی شازدە ساڵیو قوتابیی خوێندنی قۆناغی ناوەنجی لەساڵی ١٩٠٦ چاوی بەمەکسیم گۆرکی دەکەوێ و ئاشنایەتی لەگەڵدا پەیدا دەکا. هەر لەو ساڵەدا بەخێزانەوە لەگەڵ دایك و باوکی گەشتێکی شاری بەرلین دەکەن، ئەمە یەکەمین گەشتی دەرەوەی نیشتمانی بوو. بێگومان ئەم گەشتەی بۆ ئەڵمانیاو زانینی زمانی ئەڵمانی وەك زمانی دایك (رووسی) هاندەرێك بوون لەپێناوی تەواو کردنی خوێندن لە دوولرۆژدا لە سمینارێکی بەشی فەلسەفە لەزانستگای ماربۆرگ لەئەڵمانیا.

لەپاش گەشتی ئەڵمانیاو گەڕانەوەی بۆ وڵات لەکۆڕو گۆشە ئەدەبیو هونەرییەکاند نزیك دەبێتەوە. لەو سەردەمەدا لە روسیا ئەم جۆرە رێکخراوانە لەناو کۆمەڵی خوێندەوارو روناکبیران بەتایبەتی لەمۆسکۆ و سانت پیترسبورگ زۆر بوون. لێرەدا تەنیا بایەخی بە کۆڕە ئەدەبییەکان نەدەدا، بەڵکو بەشداری لە کۆڕی شێوەکاران و هی تریش دەکرد.

لەساڵی ١٩٠٨ کە بۆریس قوتابخانەی ئامادەیی تەواو دەکا، لەو دەمەدا ئاسۆی بیری فراوانتر دەبێ، هەست بەوە دەکا لەتواناو وزەیدا هەیە بچێتە گێتیی جوانکاریو بەرهەمی داهێنراو دروست بکا. لەوکاتەشدا چەندوچوونێکی تیژ لەنێوان رێبازە ئەدەبیو فەلسەفییەکانی رۆژئاوای ئەورووپا لەناوەوە بوو. لەو ماوەیەدا زیاتر لە فۆتۆریستەکان (موستەقبەلییەکان) نزیك دەبووەوە. گفتوگۆو دەمەتەقێ مایەی فێربوون و کردنەوەی دەرگای گێتیی نەزانراو بوون بۆ بۆریس. لەودەمەدا (١٩٠٩) لەگەڵ نەوەی تازەی هاوتەمەنی خۆی لەشاعیران بەشداری لەو هێرشە ئەدەبییانە دەکرد لە دژی سیمبۆلیزم (رەمزیەت) و لایەنگری رێبازی فۆتۆریزم

بـوو. لــەو رۆژگــارەدا کــەوتبووە ژێــر کاریگــەری ســێ شــاعیری گــەورەی روســیای ئــەو ســەردەمــە: بیەلی، بلۆك، خلێبنیکۆڤ.

لــەخوێندنی زانسـتگایدا لـە پێشـانا وای بـیر دەکــردەوە خوێنندنــی یاســا لەلایێك ئاسانەو لەلاییکی ترەوە رێگەی بـۆ خـۆش دەکـا بـە سـەرکەوتوویی لەگێتیی ئەدەب و داهێناندا بژی، لەبەر ئەوە ماوەییێك لەکۆلیجی یاسا دەخوێنێ. لێرەدا دیسانەوە تەنگوچەڵەمەیەکی تری بۆ پەیدا دەبێ، ئەویش گۆڕینی (یاسا)ی ئاسـان بـە (فەلسـەفە)ی قـورس، دیـارە ئەمە لەیاسا گرنگترە بـۆ ئـەو مێشکەی دەیەوێ پەروەردەی بکا بۆ ئەوەی ببێتە مەڵبەندێکی لـەباری داهێنـانی ئـەدەبی. بــەم جــۆرە خــۆی لــەکۆلیجی یاســا دەدزێتەوەو روو دەکاتە بەشی فەلسـەفە لــە کۆلیجــی مێــژوو و فیلۆلۆجــی (زمانەوانی)ی زانستگای مۆسکۆ.

بۆریس بەقووڵی دەچێتە ناو مێژووی فەلسەفەو بیری فەلسەفییەوە، هــەر لـەو کاتــەدا لــەخۆی رادەبیــنێ بەرهەمــە ئەدەبییـەکانی تۆمـار بکـا، بۆیــە لــەو تەمەنــەو لــەو قۆنــاغی خوێندنــەدا کەسایەتی ئـەدەبی پاسـتێرناك دروسـت دەبێ. جموجۆڵـی یـەکالا کردنـی رێبـازە ئــەدەبیو فەلسـەفییەکان لەمێشـکیدا دەتەقێتـەوە، لەبـەر ئـەوە دۆزینـەوەی راستی لـەلای شاعیر کـات و سـەردەمی بۆ نییـە، بـاوەڕی بەگـەڵ لـەو رێبازانـە کــردووە، وەك گۆڕانــی ئاســایی لــە رێبازێکەوە بازی داوە بۆ رێبازێکی تـر. لەو رۆژگـارەدا لـە فۆتۆریسـتەکان نزیـك دەبێتـەوەو وەك ئـەدنامی کۆڕەکـە خـۆی دەخاتە روو.

هێشـتا قوتـابیی زانسـتگای مۆسـکۆ دەبــێ لــە ســاڵی ١٩١٥ گەشــتێکی زانستگای ماربورگ دەکا، بۆ ماوەی سێ مــانگ بەشــداری لــە سمینــاری مامۆستایانی گەورەی فەلسەفە هێرمان، کۆهــین، نــاتۆرپ و هارتمــاندا دەکــا. پاســـتێرناك وەك قوتابیـــەك بـــۆ مامۆسـتاکانی بەتایبـەتی پرۆفیسـۆر کوهـین دۆزینـەوەی گەنجینەیـەك دەبـێ، لەبەر ئەوە رێگە بەقوتابیی زیـرەك دەدا لەپاش تـەواو کردنـی خوێندنـی بـەرایی لەزاســتگای مۆسـکۆ بگەڕێتـەوە بـۆ زانستگای ماربورگ و خوێندنـی بـەرزی لەوێ تەواو بکا، بەڵام پاستێرناك دەمێك بوو بڕیاری دابوو هەموو توانایێکی بیری بۆ ئەدەب تەرخان بکا، ئیتر لەبەر ئەوەی خوێندنـی بـەرزی زانسـتگا ئـەکادیمیزم بـەهێز دەکـا، ئەمـەش لـەزۆر لایەنـەوە لەگــەڵ داهێنــاندا پێکــەوە دانوویــان نـەدەکولاو نێوانیـان کـوك نـەبوو، بۆیـە

دەمێك بوو لەسەر ئەو رایە بوو، خۆی بە خوێندنی بەرزی زانستگاوە خەریك نەكا. لەبەر ئەوە لەساڵی ١٩١٣ لەو كاتەی بەپلەیەكی بەرز خوێندنی لەزانستگای مۆسكۆ كۆتایی پێ هێنا لەپاش ئەوە بەتەواوی كەوتە سەر نووسینی بەرهەمی ئەدەبیو كۆمەڵێك شیعری لیریكی بڵاو كردەوە.

(٤)

## مووچە خۆری میریو بنەماڵە

لەپاش تەواوكردنی خوێندن لەزانستگای مۆسكۆ وەك لەوەوپێش پەنجەمان بۆ درێژ كرد لەخزمەتی سەربازی بەخشرا بەهۆی ئەو شەلەییەی لەئەنجامی شكانی رانی لای پەیدا بوو. ئیتر رێگەی بۆ خۆش بوو ماڵ دابنێ و ببێتە خاوەنی خۆی. وا بوو كارێكی حكومەتی دەست كەوت و لەفابریقەیەكی كیمیاوی لەناوچەی كامای سەر بەهەرێمی ئۆراڵ. پاستیرناك ئەو چەند ساڵەی پێش شۆرشی ئۆكتۆبەر لەو ناوچە دوورانەی رووسیا ژیانی بردۆتە سەر. بەڵام سروشتی ئەم زەوییە تازانە دیاردەیێكی نوێ بوو بۆ ئەو شاعیرەی تا ئەو كاتە بەبیستن هەستی پێ دەكرد. جگە لەمە لە ئاژاوەو ناكۆكی ماڵ وێرانی جەنگیش رزگاری بوو، ژیانی تەنیاییش ئەگەرچی لەلایێك دڵ و دەروونی دەقووچاندەوە، بەڵام لەلایێكی ترەوە بەهرەی ناومێشكی دەكولاندو داهێنان بەلێشاو لەمێشكی دەهاتە خوارەوە، بەمە هەستی بەخۆشی ژیان دەكردو خۆی بەیەكێك دەهاتە بەرچاو بەرامبەر بەژیان كەمتەرخەمی نەكردووەو شەرمەزاری كەسیش نەبووە.

پاستیرناك كارێكی تایبەتیی هەمیشەیی نەبووە دارایی ژیانی بۆ دابین بكا، زیاتر لەسەر دەسكەوتی بەرهەمە ئەدەبییەكانی دەژیا، ئەگەر ئەم دەسكەوتەش نەبووایە زۆر ئاتاجی پارە نەدەبوو، چونكە تا ئەو سەردەمەش لەگەڵ باوك و دایكی دەژیا. وابوو كە دایك و باوا. و خوشكەكانی لەساڵی ١٩٢١ گەشتی شاری بەرلینیان كرد پاستیرناك لەگەڵ ئەلێكساندەری برای لەماڵی مۆسكۆیان مایەوە.

شاعیر لەنێوەندی هونەری شێوەكاریو مۆسیقا دوور نەدەكەوتەوە، ژیان بەلایەوە بێ هودەیە ئەگەر لەناو هونەردا نەبێ، بۆیە یەكەمین هاوسەری ژیانی هونەرمەندێكی شێوەكار بوو، یەكێ لە شاگردانی پیشەی باوكی ناوی یێڤگێنیا موراتۆڤا بووە، ژن و مێردایەتیان لەساڵی ١٩٢٣ دەست پێ دەكا تا ساڵی ١٩٣١. ئەم هەشت نۆ ساڵەی ژیانی لەگەڵ ئەم ژنە

هونەرەوەرەوە دەبێتە دروشمی رووییێکی ترسی موتوربەکردنی وشەی (شیعر) ورەنگ (وێنەونیگار) بەسۆزێکی نێرومێیی ئەمیش دەبێتە سەرچاوەیەکی تری ئیلهام وەکو دروشمەکەی تری کە لەگەڵ باوکیدا دروست بووە. ئەم ژیانە هەمیشەیی نەبووە، درزی تێ کەوتووە، رەنگە لە رووی کۆمەڵایەتییەوە هەموو جیابوونەوەی ژن و مێردێك کارێکی پەسند نەبێ، بەڵام لە رووی ئەدەبیو هونەرییەوە ئەم ژیانە بێ زیان بووە، بەڵکو لەقازانج بەدوور نەبووە.

لەدووای جیابوونەوە لەموراتۆڤای خێزانی لەساڵی ١٩٣١دا تووشی ژنێکی هەرەجوانی ئەو رۆژگارە بووە، زینایدا نیکولاییڤنا نۆیهاوس لەشاری تفلیسی پایتەختی گورجستان لەسایەی هاورێی نزیکی خۆی شاعیر گورج یاشڤیلی دەژیا. ئەوەندە هۆگری زیانییدا دەبێ لە پاش دوو سێ ساڵ بەرەسمی مارەی دەکاو لەگوندی پێردیلکینۆ، گەرەکی شاعیرو نووسەرانی نزیك شاری مۆسکۆ بنەماڵە دادەمەزرێنێ.

(٥)

## یەکێتیی نووسەرانی سۆڤیەت

لە ساڵی ١٩٣٤ یەکێتیی نوسەرانی سۆڤیەت دروست دەبێ و لەیەکەمین کۆنگرەیدا رێبازی (ریالزیمی سۆسیالیستی) بەرەسمی دەکرێتە یاساو دەستوور بۆ بەرێوە بردنی هەموو کارێکی داهێنراو لە ئەدەب و هونەردا بەهەموو لق و پۆپ و بابەتەکانیانەوە. پاستیرناك لەم رێخراوە کۆمەڵایەتییە تازەیەوە نزیك دەبێ. هەر ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی شاعیر هەڵبژێردری وەك ئەندامێك لە دەستەی نوێنەرانی ئەدەبی سۆڤیەتی لەکۆنگرەی نووسەرانی گێتی لەپاریس.

بێگومان هەر لەسەرەتاوە ئەوە چاوەنۆر دەکرا پاستیرناك لەگەڵ هەندێ لەو مێشك وشکانەی یەکێتیی نووسەرانیان بەرێوە دەبرد رێك نەبێ، بۆیە زوو بەزوو تووشی چەندو چوون هات لە ئەنجامی پێشکێش کردنی هەندێ بیروڕا لەدووانێکیدا لە کۆبوونەوەیەکی یەکێتیی نووسەران، ئەم کردەوەیە لەلای بیرۆکراتیەکان زیانی بۆ ریالیزیمی سۆسیالیستی هەبوو، ئەمە سەرەتای گێروگرفت بوو لەنێوان پاستیرناك و دەسەڵاتەوە.

ساڵانی پێش جەنگی دووەمی گێتی ئەگەرچی ناخۆشیی نێوان پاستیرناك و یەکێتیی نووسەران گرگرتوو نەبوو، بەڵام سەرەتای شەر فرۆشتن بوو لەلایەن یەکێتیی نووسەرانەوە، ئەو رێکخراوەی دەتووانرا بەلقێکی یەکجار ملشۆر

بژمـێردرێ لـە لقـەکانی پـارتی کۆمۆنیست. لەو ماوەیەدا شاعیردەیزانی بەرگری کردن لە شاعیرێکی ناسراوی وەك بوسف ماندلشتام کارێکی بێ سوودە، بەلاّم شەرەف وشەی پاك و هەلّویستی مەردایەتی ئەوەیان دەخواست لایەنی ماندلشتام بگرێ و لەسەری بکاتەوە، هەر لەو رۆژگارەدا (١٩٣٨) لینۆیدی کوری لەدایك دەبێ.

## (٦)
## جەنگی دووەم و گۆشەگیری

ماوەی جەنگ سەردەمی گۆشەگیری شاعیر بوو، بەلاّم لەنووسین نەکەوتبوو، بەپێچەوانە نووسینی زیاتر بوو، کەچی بلاّوکردنەوەی نەبوو، لەبەر ئەوە دەنگ هەبوو هەندێ خوێندەوارو ئەدەب دۆست پاستیرناکیان لەبیر چووبێتەوە، بەلاّم زۆربەی خەلّکی شاعیرو نووسەرو خوێندەوارو رۆشنبیر هەمیشە وێنەی لەسەر پەرەی دلّیان بوو.

لەسالّی دوایی جەنگ (١٩٤٥) لیونید پاستیرناکی هونەروەری شێوەکاری ناودار باوکی شاعیر کۆچی دوایی کرد، هەر لەو سالّەدا کۆمەلّە شیعری (مەودای سەرزەوی) دێنێتە بەرهەم، ئەم جارەیان بەئاشکراو بەشێوەیەکی رەسمی رەخنەی لێ دەگیرێ و دەسەلاّت دەکەوێتە بەربەرەکانی. تایتەرازوو وەك یەك نەبوو، چونکە راگەیاندن بەدەست دەسەلاّتەوە بوو. بۆ نووسەرو هونەروەرێکی ئەو ولاّتە هیچ دالّدەیەك نەبوو پەنای بۆ ببا، بەلّگەو رێگەیەکیش نەبوو زەمینەی بۆخۆش بکاو بتوانێ بەرگری لەخۆی بکا. ئەوەی لەسەریشی بکردایەوە دەخرایە خانەی تاوانبارو نەخۆشی شێتیو سایکۆلۆجییەوە. ئەم کردەوە ناهەموارە گەلێ لەشاعیرو نووسەرو هونەروەرە سەربەست و بێ لایەنەکانی گرتبووەوە. جاسوسیان بەسەریانەوەدانابوو، جموجۆلّ و هەلّسوکەوتی کۆمەلاّیەتیان دەپێوان. لەسەرەتا گلەیی و لەپاشانا هەرەشەیان لێ دەکردن، وابوو لەم کردەوە بێ رەووشتییەدا بەرامبەر بەشاعیرو نووسەرانی سەربەست ئەلێکسێ فادییێڤ سکرتێری یەکێتیی نووسەران ناچار کرا بەرەسمی رەخنە لەپاستیرناك بگرێ. لەمەوە سەرەتای دوور کەوتنەوە دەستی پێ کرد، پاستیرناك ئەگەر بەدوژمنی دەسەلاّتیش نەژمێردرێ بەهیچ جۆرێ بەدۆستیش دانانرێ.

لەو سەردەمەدا پاستیرناك بریاری دا خەونی گەورەی بهێنێتەدی و دەست بکا بەنووسینەوەی رۆمانی (دوکتۆر ژیڤاگۆ). ئەوی راستی بێ کاری گرنگی لەم رووەوە نووسینەوەو ئامادەکردن

بوو، ئەگینا تاقیکردنەوەی هەستی لای نووسەر دەمێك بوو کۆتایی هاتبوو و لەرووەوە پرۆژە ئەدەبییەکە لەمێشکیدا چرۆی دەرکردبوو.

## (٧)
## دووا ساڵانی ژیان

مردنی ستالین لەساڵی ١٩٥٣ رووداوێکی یەکجار گرنگ بوو لەکۆمەڵی رووسیادا، خەریك بوو هەندێ گۆڕانکاری رووبدا، لەسەرەتادا ئەمە کاری کردە سەر بزوتنەوەی ئەدەبی و هونەری، هەست بەبۆرە سەربەستییەك دەکرا، بەڵام سیستەمەکە ئەوەندە تۆتالیتاریانەو یەك لایەنی بوو، بەهیچ جۆری پینەکردنی بەرووکەشی دیمۆکراتی ئامێز چارەی کۆمەڵەکەی نەدەکرد. دەبوو لەبنجدا بهەژێ، بۆیە ئەو پشوودانەوە بەناو سەربەستییە کەمە دەبوو زوو لەناوبچێ و گێڕانی ماکینەی دەوڵەت بگەڕێتەوە دۆخی جارانی.

لە پەنجاکانی ئەم سەدەیەدا تەنگوچەڵەمەی نێوان پاسترناك و دەسەڵات دەگاتە پۆپە. لەکۆمەڵ لاتەریك دەکرێ، رۆمانی (دوکتۆر ژیڤاگۆ) دەبێتە مایەی هەرەشەو گورەشەو بەربەرەکانی. لەساڵی ١٩٦٧ بڵاوخانەی دەوڵەت لە مۆکسۆ چاپ کردنی (دوکتۆر ژیڤاگۆ) رەت دەکاتەوە. لە ١٥ تشرینی دووەم ١٩٥٧ بۆ یەکەمین جار تەواوی تێکستی رۆمانی (دوکتۆر ژیڤاگۆ) بەزمانی ئیتالی لە ئیتالیا بڵاو دەکرێتەوە. لە پاش ئەمە وەرگێڕانی رۆمانەکە بەگەلێ لەزمانە گەورەو بچووکەکانی ئەورووپا بڵاو دەکرێتەوە.

لە ٢٢ی تشرینی یەکەمی ١٩٥٨ میدالیەو باوەڕنامەو خەڵاتی نۆبل وەردەگرێ، ئنجا لە ئەندامیەتی یەکێتیی نووسەران دەردەکرێ. بەوەش ناوەستێ خەریك دەبن لەهاوڵاتیەتی روسیا نامرادی بکەن و لەنیشتمان دووری بخەنەوە. بەم جۆرە کێشەی پاسترناك، کێشەی مرۆڤ، کێشەی ئازادەمزادێکی گەورە دروست دەبێ ئەمەش بێگومان ناوەڕۆکی لێکۆڵینەوەیەکی سەربەخۆیە.

لە رۆژی ٣١ی مایسی ساڵی ١٩٦٠ پاسترناك بەنەخۆشی شێرپەنجەی سی کۆچی دوایی دەکا، پیاوێکی گەورە لەخەفەتی ئەوانەی بەراستیان نەبوو لەیەکسانی دەگەڕان سەری نایەوە. پاسترناك و کەسانی وەك ئەو لەکردەوەکانیاندا بەراستیان بوو، لەبەر ئەوە جارێکی تر زیندوو بوونەوە.

هەولێر: مەڵبەندی رووناکی
١١ی کانوونی دووەمی ١٩٩٨

# بێژە و مەبێژە

**دڵـــزار**

١ـ بێــژە: بەیاننامەکــەی یـــازدەی ئـــادار..... نـــەبێژە بەیاننامەکـــەی یازدەی ئازار...

چونکە لەبنیاددا، مانگەکە نـاوی (ئـــادار)ە، نـــاوێکی ســـریانییە، عەرەبـــــەکان کردوویانەتــــــە (آذار)کوردیش چونکـە پیـتی (ذ)ی نییـە، دەیکـەن بـە (ز)ی و دەپـەیڤین ئازار.

برایـان دەسـتوری زمـانی عـەرەبی زۆر (د) دەکا بـە (ذ) وەکـو: همــذان. قوبــاذ. ســاذج. فــالوذج/ مؤبــذ. نوخذه.... لـەباتی، هەمـەدان، قوبـاد، سادە، پالـودە(جۆرە خواردنێکـە وەک محەللـەبی) موبــەد(پیـاوی دیـنی زەردەشتی) (نـاخودا)یـان نـاو خـوادا ـ خـــاوەن کەشـــــتی، کەشــــتیوان بەفارسی...

لەپاشان ئـازار نـاوێکی ناخۆشـەو لێدان و ئەشکەنجەی بەندیخانەکانمان دەخاتـەوە بیر، بۆیـە باهـەروەک خـۆی بپەیڤین و بلێین: ئادار

خـــۆ کـــورد هــــەر لەکۆنــــەوە گوتویـەتی: (لەهـەژدەی ئاداریْ، بـەفر بگاتـە گوێــی داریْ نـامێنیْ هــەتا ئێواریْ).

٢ـ بێــژە: بەرپرســێکی عـــیراقی بیســـت هـــــەزار دۆلاری دزی.... نەبێتـە: (... بـەدزینی بیست هـەزار دۆلار هەستا...)

برایــان کوردقــەت قســـەی وابــیْ ســەروبەر ناکــا، ئەمــە وەرگــێڕانێکی حەرفی رستەی عەرەبییە: (قام مسؤول عراقي بسرقة عشرين الف دولار...)

برایـــان هــــەر زمــــانێک داب و دەســـتوری خـــۆی هەیــە و جیــاوازە

لەزمانانی دی، ئەم ڕێزمانەی ئێمەش لەپرۆسێسی مێژوو لەماوەیەکی دووروودرێژدا دروست بووەو جیاوازییەکی زۆریشی لەگەڵ گروپە زمانەکانی غەیری هیندۆ ئەوروپاییدا هەیە، بەتایبەتی لەدەستوری گروپە زمانەکانی سامیپیەوە زۆر دوورە بۆ نموونە: عەرەب دەڵێ: (ضرب تعالیمه عرض الحائط) لێرەدا (عرض) بەمانای (ناحیه) نەک پانایی دێ...

بەڵام کورد دەڵێ: (ئامۆژگاریەکانی پشت گوێ خست).

٣ـ بێژە: (سرنج) نەبێژە: (سەرنج)، لەسەرەتای پایزی ساڵی ١٩٦٠دابوو، کە پتر لەمانگێک لە ئاپارتمانێکی باڵاخانەیەکی پاک و سپی لەشەقامی شێخ عومەری بەغدا لەگەڵ گۆرانی گەورەدا بەیەکەوە دەژیاین و پێی دەگوت: کۆشکی سپی! جا لەوێدا گۆران دەیگوت: (سرنج راستە نەک سەرنج، ئەم سەرنجە گوتنە عەلائەدین سەججادی دایهێناوە، ئەگینا هەموو شارەزووریەکان ـ سرنج ـ ئەڵێن...)

لەلاپەڕە (٢٠٦)ی دیوانەکەی گۆرانیشدا، جگە لەشوێنانی دی، بەخەتێکی درشت سەر ناوی هەڵبەستێکی ئاوا نووسراوە

دوا سرنج...

(بۆ قژ زەردی بەردەرگا، لەسەرەرێی بەندیخانەما لەموصلەوە بۆ هەولێر)

لەراستیدا وشەی سرنج کە هاوکێشی برنج و ترنجە تا بڵێی وشەیەکی جوان و موسیقادارە، سەیرکەن لە چوار پیت پێکهاتووەو هەر چواریشیان ساکینن، کە ئەمە لە زمانی عەرەبیدا هەر نییە، ئەوان هیچ وشەیەکیان نییە کەدوو ساکینی لەدوو یەکی تێدابێ.

٤ـ بێژە: ڕژێمی دکتاتۆری.. نەبێژە: رژێمی دکتاتۆری، چونکە ئەم وشەیە بەئینگلیزی (ڕێجیم)ی پێ دەڵێن و ئاواش دەنووسرێ، (regime) بەفرەنسی و روسیش (ڕێژیم)ە.

هەروەها ئەگەر گوێ لە رادیۆکانی جیهان بگرین بە رادیۆیە فارسی و کوردییەکانی کوردستانی ئێرانیشەوە ئەوا گوێ بیست دەبین کە هەر هەموویان ڕێجیم یان ڕێژیم دەپەیڤن.

٥ـ بێژە: بارە گەنمەکەم لاسەنگ بوو دامگرت و تاوتووم کرد... نەبێژە: دامگرت و تاوتوێم کرد. چونکە (تاوتوێ) ژانی برینە.

# خوێندنەوەیەکی رەخنەیی

# هەڵوەشاندنەوەیی (تەفکیکیەت)

ئازاد خدر

بیری بونیاتگەری بەگشتی و بونیاتگەری (تەفکیکی) بەتایبەتی هەڵوێستێکی قووڵی فەلسەفییە لەئاخاوتندا (کلام)، هەر ئاخاوتنێک لەم فەلسەفەیەدا هێرش بردنە سەرو داپلۆسینی (بوون)ە.

گەر بێتو هەڵوێستی بەرامبەر بەئاخاوتن وا بێت ئەوە بێ دەنگی باشترین هەڵوێستە کە بەهۆیەوە مرۆڤ دەتوانێت سنوورێك بۆ بوختان و درۆ بەخۆ کردن و بەجیهان دابنێت.

رێچکەی (تەفکیکی) خۆی بەپێوەرێکی زانین نابەستێتەوە لەرەخنەکانی لەدەقەکان، چونکە زانین بەواتەی ئەو رێچکەیە دەست درێژ کردنە بۆ سەر بابەت کەناتوانین لێی بگەین هەرچەندە خۆمانی پێ ماندوو بکەین و هەوڵی بۆ بدەین. ئەم تیۆرە پتر گرنگی بە (رووداوەکانی دەق) دەدات یان گرنگی بەراستیی دەق دەدات راستییە ئەنتۆلۆژییەکەی، بەڵام ئەوەی جێی سەرنجە تیۆرەکە لەروانگەیەکی ئەپستمۆلۆژی دەبێتە دیلی رووداوەکانی دەق، کاتێ مامەڵەی لەگەڵدا دەکات یان کاتێ مامەڵەی لەگەڵ هەر بابەتێك و کێشەیەکی عەقڵی دەکات، لەم بارەیەوە (جیرار جینیە) دەڵێ:(دەق لای من بانگەوازێك نییە بۆ راستییەکی گشتی یەك لایەن بەڵکو گوتارێکە - خطاب - راستی خودی خۆی دەخوڵقێنێت و بەشداری لەبەرهەم هێنانی راستی دەکات کاتێ خۆی بەسەرماندا دەسەپێنێت و هانمان دەدات بۆ ئەوەی بیخوێنینەوەو دووبارە بیدۆزینەوە. واتە دەق تەنها شایەدێك نییە بۆ راستی، راستی سەردەکەمەی یان نووسەرەکەی یان پانتایی عەقڵی بەڵکو شتێکە بەردەوام لەخۆی جیا دەبێتەوەوە جیاواز دەبێت لەخۆی بەئاخاوتنی جیاواز دەربارەی) واتە نووسین دەبێتە شێوەیەك لە شێوەکانی ژیان و بوونی تایبەتی مرۆڤ و تەنها کاردانەوەو رەنگ دانەوەی جیهان نییە بەڵکو هەوڵدانە بۆ خوڵقاندنی جیهانێکی تر کەتیایدا وشەکان شوێنی شتەکان دەگرنەوەو چێژی دەق شوێنی چێژەکانی جەستە دەگرنەوە. نووسەریش راستی دەگێڕێتەوە هێندەی

ئەوەی راستی ساز دەدات.

بێگومان دان پێدانان بەرووداوەکانی دەق هەنگاوێکی پێشکەوتووە لە بوارەکانی زانستی کۆمەلآیەتی و فەلسەفی. دەق بەو مانایە تەنها ئامرازێك و ئاوێنەیەکی راستیی بابەتی نییە، بەڵکو قەوارەیەکەو یاسای تایبەتی خۆی هەیە.

شتێکی تریش هەیە لێرە، گەڕان بەداوی و دۆزینەوەی ئەم یاسایانەو چوونە ناو دەق واتە ئاشکرا کردنی ستراتیژەکانی دەق هەروەك (فوکۆ) دەڵێ:( ئەم نزیك بوونەوەیە لەدەق دەبێتە هۆی کوشتنی تیۆری زانین و زیندوو کردنەوەی زانستی بوون لەجیاتی). بوون لێرەدا دەقەو هیچ شتێکی تر نییە. ئاوا پچڕاندنی و هەڵوەشاندنی دەق لەجیهانەکەی دەبێتە مایەی کورت کردنەوەی زانین بۆ تەنها توێژینەوە لەپەیوەندی خودی بیر لەگەڵ دەقدا. لایەنگرانی ئەم تیۆرە لەکارە فەلسەفیو ئەدەبییەکانیان وای بۆ دەچن کە دەقەکان تەنها ئەوە نین کە گوتراون بەڵکو ئەوانەن کەنەووتراون. جگە لەمەش هەڵوەشاندنەوەیی (تەفکیکیەت) بەیەکسانی سەیری دەقەکان دەکەن هەر وەك (جولیا کریستیڤا) دەڵێ:(مامەڵە لەگەڵ هەموو دەقەکان بەیەکسانی وەبەبێ جیاوازی کردن، ئەمەش تیۆری دەقم بەسەر دەسەپێنێت. من مامەڵە لەگەڵ دەق دەکەم بێ ئەوەی رەچاوی زمانی خاوەنەکەی یان پێناسەکەی یان بیروباوەڕەکەی یان چەرخەکەی بکەم لەوانەیە یەکێکی تر بێت ئەم شتانە بکات و دەقەکان جیاواز بکات بەپێی ئاستی رۆشنبیری و عەقڵییەت و جوگرافیاو رێچکەی ئایدیۆلۆژیایان).

ئێمە یەکەم جار ئەم هەڵوێستە هەڵوەشاندنەوەییە بەرامبەر بەبیرو ئەدەب زۆر بە (لیبرالی) و دوور لەتوندوتیژیو پۆزەتیڤ لەقەڵەم دەدەین، بەلآم ئەم (لیبرالیەتەی) هەر زوو هەڵدەوەشێت کاتێ بە وردی سەیری دەکەین، بانگێشە بۆ بەرهەم هێنانی دەقی کراوەوە جۆراو جۆرو دوور لەداواخوازی راستییەکانی دەبێت پرسیارێکی لێ بکرێت دەربارەی مەبەست لەم خەسڵەتەی دەق چییە. ئاشکرایە کە وا نووسینە هەڵوەشاندنەوەکان وای بۆ دەچن مەبەست لەلابردنی مەرجی دەق ئەوەیە کە ناهێڵێت مرۆڤ ئازاد بێت لەپەیوەندی لەگەڵ دەقدا لە قەدەغەکان و راستییە رەهاکان واتە رزگار کردنی مرۆڤ لەدەسەلآتی دەق. باشە چیتر؟ ئازاد بوون لەدەسەلآتی دەق شتێکی باشە بەلآم خۆبەستنەوەی پەیوەندیمان بەدەق لە چوارچێوەی رزگار بوون لێی بەتەنها بەس نییە، چونکە وەلآمی ئەو پرسیارە ناداتەوە: پەیوەندی بیر چییە لەگەڵ واقیع؟ ئایا ئەم پەیوەندییە واتە سیفەتی بیری ئەپستمۆلۆژی هیچ

بەشداری هەیە لەرزگار کردن و ئازاد کردنی مرۆڤ؟.. بانگێشەو داواکردن بۆ خولقاندنی دەقی کراوەو هەمە جۆر کە ناهێڵێت دەق ببێتە دیلی خودی بیرکەرەکەی دەبێت مۆڵەتیش بدا بەهەموو جۆرە ئاخاوتنێك کە ئاخاوتنی نووسەرەکەش دەگرێتەوە. ئێمە لێرەدا دوو رێگامان لەپێشە: یان دەبێت مل کەچی دەسەلاتی دەق بین یانیش خۆمانی لێ رزگار کەین لەسەر بنەمای کراوەیی رەهای دەق و توانای لەباوەش کردنی خودی رەهاش. بەکورتی هەڵوەشاندنەوەیی (راجێتێکە) لە بولری خوێندنەوەی بیر وەك قەولرەیەکی سەربەخۆ بۆ ئەوەی رزگار بین لەدەسەلاتەکەی. لێرە دەبێ بوترێ کە مەرجەکانی بەرهەم هێنانی زانین و وا دەخولزێتن دووبارە ئەرکی زانینی بیر دامەزرێنین لەجیاتی ئەوەی بیکوژین واتە کوشتنی واقیع و پەیوەندیمان لەگەڵ بابەت. دەشبێت لێرەدا دوو شت جیا بکەینەوە: کردنی واقیع بە بابەتێکی توێژینەوەی بەردەوام لەگەڵ دان پێدانان بەمەحاڵییەتی پەیوەندی زانینی لەگەڵیدا. ئەم خۆبەدەستەوەدانەو دان پێدانانە بەمەحاڵی ئەو پەیوەندییە لەگەڵ بابەت دەبێتە مایەی تێئاولرەبوونی بەهاکانمان. هەڵوێستی روناکبیرانە لەهۆشی مانای ئەوەیە چەندە هۆش نزیك بێتەوە لەبابەتەکەی ئەوەندە مرۆڤ دەتوانێت پتر کۆنترۆڵی خۆی بکات و کۆنترۆڵی هەلومەرجی کۆمەلایەتی و فیزیکی بکات. واتە رزگار بوون لەدەق بەرێگای هەڵوەشاندنەوەیی بەس نییە بۆ ئازادی مرۆڤ لەدەوروپشتەکەی تەنها لەو حاڵەتە گەر بێتو ئێمە دەوروپشت و واقیعمان کورت کردەوە بۆ رووداوەکانی دەق بەتەنهاو خۆمان کردە دیلی دەق. بەڵێ راستە پەیوەندییەکانی هێز دەشێ راستییەکانی خۆی بێنێتە ئاراوەو خۆشی لەناوی بشارێتەوە بەبیانووی ئەوەی گشت راستییەکان ئەنجامی داپلۆسین و دەسەلاتن و هیچ زانینیش نییە دوور بێت لەگەندەڵی ویستی هێز. بەلام پراکتیکی تایبەت بەبەرهەم هێنانی زاتی و تێگەیشتن بریتییە لە ئالوگۆڕکردن لەگەڵ واقیعی دەرەوە بەجۆرێك کەبتوانێت و ببێتە بنەمای خولقاندنی راستییەکان و زانینەکان.

هێزیش لەتەوەری بەرهەم هێنانە. جیاولزی کردنی نێوان مێژووی ناوەوەی بەرهەم هێنانی زانین و مێژووی دەرەوەی گرنگییەکی زۆری هەیە هەر وەك (جۆرج لۆکاتش) رروونی کردەوە. چونکە رەچاو نەکردنی ئەم دوو مێژووە هەروەك (ئەلتوسیر) دەڵێت دەبێتە مایەی (لەناوچوونی سەربەخۆیی رێژەیی چالاکییە مرۆڤایەتیەکان) لەوانەش چالاکی بەرهەم هێنانی راستییەکان و زانینەکان. لێکۆڵینەوەکانی (فوکۆ) دەریان خست کە کاریگەریی

پەیوەندییەکانی هێزو کۆنترۆڵ کردن لەناوەوەی پراکتیك کە زانینەکان بەرهەم دێنێت یەکجار زۆرە ئەمەش شتە هەرە باشەکەی (فوکۆ)یە. بەلاّم ئەو هەلوێستە ئەگەر درێژ بکرێتەوەو (تعمیم) بکرێت لەو شێوەیەی کە قوتابخانەی رەخنەی نوێ دەیکەن، دەبێتە مایەی ئەوەی کە چالاکی زانین کورت بکرێتەوە بۆ تەنها کاریگەری دەسەلاّت و ستراتیژەکانی هێز بەسەریدا. پێش هەموو شتێك رەخنە وا دەخوازێت کە شێوە جۆراوجۆرەکانی پەیوەندییەکانی دەسەلاّت (ئابووری، رامیاری، رۆشنبیری...هتد) بدۆزێتەوە. لەولاّتانی جیهانی سێیەم لەوانەش کۆمەڵگای کوردەواریمان و روون کردنەوەی کاریگەری جیاوازی لەسەر بەرهەم هێنانی زانین. لێرەش هەندێ کاریگەرییەکان و کارتێکردنەکان دەرەکین، واتە مەرجەکانی رامیاریو رۆشنبیری و ئابووری دێنێتە ئاراوە کەدەبنە بەربەست و کۆسپ لەپێش بەرهەم هێنانی زانین چونکە واتای مێژووی دەرەکی زانینەکان فاکتەری کۆمەلاّیەتیش بەخۆوە دەگرێت بۆ پراکتیکی زانین و پەیوەندی دینامیکی لەنێواندانیاندا بێ ئەوەی هەروەك (فوکۆ) کردی سنووری نێوانیان نەهێڵێت. بەلاّم کاتێ فاکتەرە دەرەکییەکانی کۆمەڵ دەبنە بابەتی پراکتیکی زانین نابێ دەوری ئەپستمۆلۆژی ئەم پراکتیکە رەچاو نەکەین هەتا نەبێتە هۆی لەناوچوونی پەیوندی نێوان بەرهەم هێنانی زانینەکان و بابەتەکەی هەروەك تەفکیکیەکان دەیکەن و دەقیش دەکەن بە ولاّتی بوون و بەندیخانەی هەمیشەیی بوون. (مارك ئەنجینۆ) یەکێکە لەرەخنەگرانی نوێخوازی دەڵێت: (ئەو شتانە وەرناگرێت کە دەبنە کۆسپی بەردەم راستی و هەڵەیان نێوان عەقڵ و ناعەقڵ یان نێوان نموونەو ئەزموون یان نێوان جەوهەرو روالّەت یان نێوان خێرو شەڕ... هەڵە لێرە رووی دووەمی راستییە و ناعەقڵ بنەمای شاراوەی عەقڵەو شەڕ خێرێکی لاوازە یان دەتوانین بڵێین خێر شەرێکی بەهێزە... لێرە ماوە نییە بۆ جیابوونەوەی ئەنتۆلۆژی نێوان دژەکان چونکە سیمای بوونەوەر، جۆراو جۆرەو جیاوازیو لێك دابرانو وروژانە..) ئەمەش مەبەستی رێچکەی تەفکیکیەتە. نەهێشتنی ئەرکی زانینی دەقەکان دەبێتە هۆی نەهێشتنی پێوەرەکانی ئەخلاقی و ئیپستمۆلۆژی نێوان دەقەکان و نەهێشتنی جیاوازی لەنێوانیاندا.

سەرچاوەکان:

١- في اصول الخطاب النقدي الجديد/ ترجمة احمد المديني

٢- الحداثة/ جزء ٢،١/ مالكم برادبري و جيمس ماكفارين/ ترجمة مؤيد حسن فوزي

# نوقلانەکانی سەرهەڵدانی رۆمانی کوردی

ئـوفـە

لەم دوو ساڵەی دواییدا چەند رۆمانێکی کـــوردی بـــەدوای یێکـــدا ، چـــاپکران و بڵاوکرانـــەوە .. هـــەندێکی بـــە تـــیراژێکی کـــەم و، هـــەندێکی بـــە ســـەدان ژمـــارە ،. لەوانـە(ئاوێنـە سـەرابێکان) ی هیـوا قـادر (کاولاش) ی عەبدوڵڵا سەراج، ( ئەژدیها )و (هـــەرەس)ی محەمـــەد موکـــری، (مـــەرگی تاقانـــەی دووەم)ی بـــەختیار عـــەلی، (درز)ی کاکـە مـەم بۆتـــانی، (ئـەنفال)ی محەمـــەد رەشید فەتاح ، (تاریکســـتانی لم) و (وڵاتـــی تارمـــایی) ســـەلاح عومـــەر ، (گولســـتان و شـــەق)ی حەســـەنێ ســـلێڤانی، ( دۆزەخ ) سەیید ئەحمەد حەمەلاو ( سەعید زەبۆکـی لای خۆمان)ی کەمال سەعدی و( مۆسیقای مەرگی ناوەختە) ی سەلاح جەلال و گەلێکی دیکەش بـەدوایاندا بەرێوەیـە و هـەر لـەم ســاڵدا دەکەونــە بــەردیدی خوێنــەران و تۆژەران .. بەتایبـەتی دوو رۆمـانی شـەهید دلشـاد مـەریوانیو رۆمـانی (مـیرە گـوڵ)ی حەمە رەشید فەتاح و ,,, هتد.

لەوانەیە بڵێن کەزۆربەی ئەم (رۆمانانـە) لـەمێژە نوســـراون و ، بەتایبەتیگـــەلێکیان دەگەڕێنـەوە بۆ سـەردەمی بەر لە راپـەڕین ، ئەمـە راستەو ، دەبێ ئەمـــەش رەچاوبکـەین کـە ئـەو مودەتـــەی دوای راپـــەرین چـــەند ســاڵێکەو ، بـە دەگمـــەن رۆمـان هەیـە لـەو زەمەنـــــە کورتـــــەدا بنوســـــرێت و ، رۆماننووسانی جیهانیش چەندین سـاڵ .. تاکو دەیان ساڵ بە شاکارەکانیانەوە خەریك بـوون و، تەبیعـەتی ئـەم هونـەرە ، پشـووی درێـــژو ، درێژخایـــەنیی و ســـەقامگیریی گەرەکە ، سەرباری رۆشنبیریی هەمەلایەنەی فراوان .. کە زۆر جار رۆماننووسـی ناچـار دەبێت چـەند سـاڵێك بـە دووی سـەرچاوەی رووداوەکـاندا بگـەرێ، لەپاڵیشیدا سـەرقاڵی ژێدەرە زانستیو کۆمەڵایەتییەکان بێت ..

کەواتە کێشەی ئەو مودەتە زەمەنییەی نووسەر پێوەی خەریك بووەو، کەی تەواوی‌کردووە ، هێندەی کاتی چاپ و بڵاوکردنەوەی گرینگ نییە.. چونکە ساڵی چاپ کردنی بە زەمەنی راستەقینەی لەدایکبوونی بەرهەمەکە دادەنرێت .. جا ئیتر کەی ئێکسپایەر دەبێت ، یاخود بەئیکسپایەری یاخود بە سەقەتی هاتۆتە دونیاوە ؟! ئەوە ئۆبالی بە ئەستۆی نووسەرەکەیەو ، گرینگ ئەوەیە کە ئێستە ئێمە لە بەردەم لێشاوێکی (رۆمانی کوردی) داین .. تکایە لە وشەی (لێشاو) زویر مەبن، مەسەلە مێنەوە .. چونکە لێرەدا تەنیا مەبەستم لەوەیە کە بە نیسبەت ئێمەی کوردەوە .. لەم هەلو مەرجەشلۆق و ناسەقامگیرییانەدا ، بەم گەمارۆ رۆشنبیرییەوە کە لە سەرمانەو ، لە هەمان کاتدا بە بەراوردکردنی ژمارەی ئەو بەرهەمانەی لەم هونەرەدا و لە ماوەی دەیان ساڵی رابردوودا .. ئەوا دەشێت بێسەڵمینەوە ،ئەم خەرمانە رۆمانەی ئەم دواییە بەدیاردەی سەرهەڵدانی رۆمانی کوردی لە قەڵەم بدەین و ، مایەی خۆشحاڵو جێی شانازیمان بێت .. جا ئیتر ئاستی هونەری و فیکری و فەلسەفییان چەندە وچەند نییە ، با رێز لەو سەدان و هەزاران پەرە کاغەز و دەستنووس و شەونخوونییانە بگرین ، کە نووسەرانمان بە تاریکی و بەسکی برسی بە دیار ملیۆنەها وشەی کوردییەوە ئێشکییان گرتووە و ، لەوەش بێئومێد بوون کە رۆژی لە رۆژان ، بەرهەمەکانیان رووناکایی دەبینن .

ئێمە دەیان ساڵە خاوەنی چەند رۆمانێکی هێند کەمین کە بە پەنجەکانی دەستمان دەژمێررێن .. هەرە دیارەکانیان نۆڤلێتی ( لە خەوما ) ی جەمیل سائیب و ، (چۆن بووم بە خانەدان)ی ئەحمەد موختار جاف و، (قەلای دمدم)ی ئارەبی شەمۆو، (ژانی گەل) ی ئیبراهیم ئەحمەد ـ بلە ـ و (کوێخا سێوێ) ی عەزیزی مەلا رەش و ، (پێشمەرگە) ی رەحیمی قازی و ، (گەماڵ)و (کۆردەرە) و ( ران) ی خوسرەو جاف و ، (شار ) و (ئەندێشەی مرۆڤێك)ی حوسێن عارف و، ( ئاشتی کوردستان) ی محەمەد ساڵح سەعیدو چەند هەوڵێکی دیکەش ..

کەواتە بە دڵنیاییەوە دەڵێین ، ئەم لێشاوەی ئەمڕۆ لەم هونەرە شارستانێتییەدا، مژدەی بنەمادا کوتانی رۆمانی کوردی لە هەناودا هەڵگرتووە .. هەروەك چۆن بێگومانم لە کەم و کوورییەکانی رۆمانەکانی دەیان ساڵی لەمەوبەرمان .. بە هەمان شێوەش بێگومانم لەوەی هەر یێکێك لەم رۆمانانە یان ئەم (هەوڵانە)ی ئێستاش ، کەم تا زۆر لە خەوش و کەمو کووڕی بە دوور نین . بەڵام بوون و بەرامبەی نوێکردنەوەو هونەری

سەردەمییان لێهەڵدەستێت .

جا بۆ ئەوەی ئەم دیاردەیە بە بێدەنگی نەپروات ، یاخود تەنیا چەند قەڵەمێکی موجامەلەکەر زەفەر بەو بێدەنگی و هەڵنەسەنگاندنە بە پیرۆ راستەقینانە نەبەن و ، بەناوی (خوێندنەوە ) وە ، بکەونە شاباشکردن و پێداهەڵدانی بەرهەمی برادەرەکانیان و ، سوکە هەوڵێك بکەنە شاکارو شاکارەکانیش سووك بکەن.. کە ئەمیش خۆی لە خۆیدا لەم رۆژگارەماندا وەك دیاردەیێکی نەزۆك لە ئارادایە .. ئاخۆ لە (خوێندنەوە)ی دەقێکدا دەشێت خەتێکی راست و چەپ بەسەر گشت کولتووری نەتەوەییێکدا بێنیت ؟! یاخود هەر چی رۆمانی کوردی هەیە هەمووی رەتکەیتەوە بڵێیت ئێمە رۆمانمان نییە .. ئایا جەنابتان وەك خۆتان پێتانخۆشە بڵێن ( خوێندنەوە ) چیتان خوێندۆتەوە، رۆمانی برادەرەکەتان یان گشت رۆمانی کوردی ؟! ئایا (خوێندنەوەی دەقێك ) بەلای ئێوەوە کارکردن نییە لە خودی دەقەکەدا ؟! ئەدی بۆچی دەست لە دەرەوەی دەقەکە دەوەشێنێت ؟! لەو (خوێندنەوەدا )چ کارێکت بەسەر ئەو دەقانەوەهەیە کە (نایانخوێنیتەوە) یان هەر بە راستی نەشتخوێندوونەتەوە ؟!

ئێمە پێمان باشە دەقەکانی دیکە (بخوێنیتەوە) .. یاخود رەفزیان بکەیت.. بەڵام چۆن رێگە بەخۆتدەدەیت بڵێیت کە گوایە ئێمە تا ئەو رۆمانمان نەبووە .. یان رۆمان لای ئێمە دروستنەبووە !..

خۆ ئەگەر ئەم بریارە قەرەقووشییەش قوبووڵبکەین و لاریمان لێی نەبێت .. یاخود بە بۆچوونی تایبەتی کەسێکی دابنێین و ، واشی دابنێین رۆمانی کوردی لەو پەری قات و قری و کرچوکاڵیدایە .. بەڵام کەدێتە سەر باسی تێکستەکەی ، یاخود (ئەزموونەکەی ) برادەرەکەی سوبحانەڵلا ! نەبکەیت و نەبخۆیت ، سەیری جەستەو ، بەژن و بالاو بونیادی میعماری رەهەندە مۆجیزە ئاساو ، دەنگە جۆراوجۆرەکان و هونەری تێکەلاوکردنی کەسی یێکەم و سێیەمی تاك و کۆو نێرو مێ و چێشتی مجێوری ئەو بکەیت ، کە گوایە لە تەوزیفی ئەفسانەدا حەویەڵی بە پشتی کامۆ و برنادشۆدا داوەو ، لە فانتازیاو واقیعی سیحریدا !! حەفتاو حەوت فرسەخ بۆری مارکیز و هێرمان هێسەی جێهێشتووەو، هێرمان مەلڤیل هێندەی ئەم کوردەی نێو کوردستانی بێ ( دەریا ) ، شارەزای نهێنییێکانی دەریا نەبووەو ، فرۆیدیش لە وابەستەکردنی خەون و واقیعدا نەیتوانیوە شان لە شانی بدات و ... بەمجۆرە کە لە خوێندنەوەی ئەو دوو سێ لاپەرەیە دەبیتەوە کە بۆ( خوێندنەوە)ی ئەو تێکستە تەرخانکراوە .. وا هەستدەکەیت

سەرجەمی مێژووی ئەفراندتی بەشەرییەت شتی وەك ئەو نووسەرەی ئێمەی بە خۆیێوە نەدیوە .

ئەدی باشە ئێمەی پاشکۆی ولاّتانی کەناری هەشبەسەر رۆماننووسی و شاکاری وامەزنمان هەبێت باکمان چییە ؟! کامەیە دواکەوتنەکەمان لە کاروانی شارستانی؟! خۆ تاکە رۆماننووسێکی وا، یاخود ئەوپەڕی دوانی لەوجۆرە سەروزیادمانە .. چونکە ناوبانگی رۆمانی ئەمەریکای لاتینی بە سێ چوار رۆماننووسی وەك مارکیز و ئوستریاس بۆرخیسەوە لە جیهاندا دەنگی دایەوە .. زێتر لە سەدوو پەنجا ساڵە رۆمانی رووسی و سۆڤێتی بە دیستۆیڤسکی و تۆڵستوی و لێرمەنتۆڤ و ئیتماتۆڤەوە ناسراوە ، کە سەدان ملیۆن سەرژمێرێتی و وەك ئێمەی کۆڵەوار بندەست و کۆلۆنیالکراویش نین .

کەواتە ئەم ماستە بێ موو نییە .. ئەو جۆرە پەسن و شاباشکردنە نا دروست و بێ بنچینانە هەر لە ئاکامی ئەوەوە نین کە برای ( دەقخوێنەر ) یان (دەقخوێن)ی لەمەر خۆمان بێئاگایە لە ئەزموونەخۆماڵی و جیهانییەکانی رۆمان و هونەری رۆماننووسین .. بەڵکو پێدەچێت .جگە لە دەیان هۆی لاوەکی دی ، ( ترس ) یێکی گەورەش لە ئارادابێت .. ئەو ترسە نەفرەتییەی کە سەرجەم ( موخەیخ ) و

هەناوی تەنیوە.. بە هیچ جۆرێك دەرفەتی ئەوەی نادات جورئەت بکات و ، بەتەنیا رستەییك ، یاخود بەتەنیا پرسیارێك دەقەکە بخاتە بەر گومانەوە .. کاکی (خوێنەری دەق) ناوێری لە خاوەنی (شاکار !) بپرسی! ئەرێ کاکی برا ئەم زمانە شەق و شڕو کوردییە سەقەتەت لە کوێوە هێنا ؟ چونکە دەترسێت بەوە تاوانباری بکەن کەلە نهێنی تێکشکان و دروستکردنەوەی زمان و جیاوازی نێوان هەردوو حاڵەتی سایکرۆن و دایکرۆنی زمان نەزانێت ! ( ئەدی برا ئەم هەموو درێژدادڕی و بێسەروبەریی و دووبارەکردنەوە بێلەزەت لە پایچی ؟! ) .. دەترسێت تۆمەتی کاڵفامی لە هونەرو تەکنیکی رۆمانی سەردەمدا بخرێتە پاڵ کە نەیتوانیوە بە وردی لە نێو چینەکانی جەستە دووبارەکراوەکاندا کاربکات و پەی بە تێز و بیرۆکە و هێماو سروشە نهێنییەکان بەرێت .

ناوێرێت بپرسێت ( ئەم هەمووە ئەندێشەو گینگلدانە دەستکردو درۆزنانەیەت لە کوێوە هێنا کە(راسکۆلینکۆف) لە چاویدا (مامە کوڕنوو)ی راکشاوی گردەکەی سەیوانەکەمانە لە سەر رەحەتی و دڵبێگرێبیدا ؟! )چونکە دەترسێت مۆرکی ساویلکەیی و کەم ئەزموونی لە بواری کێشە سەخت و پڕ ئەندێشەکانیسەردەمدا

لــە تــەوێل بدرێـــت و ، لـــە فانتازیـــا و ڕەهــەندەکانی خــەیاڵ و گوزارەکـــان لـــە حالەتـــەکانی غوربـــەت و تـــەنیایی و نەخۆشییە دەروونییەکاندا ئیمتیحان بکرێت و بێگومان تێیاندا ساقیت دەبێت !!

ئەمجا جگە لە مانیش .. دەبینین کاکی (دەقخوێن) لە دوا پەرەگرافدا و لە ترساندا هێندەی دیکەش خۆی بچووك دەکاتەوەو، دەڵێـــت ئـــەوەی نووســـیومە تـــەنیا (خوێندنەوە)یێکی سەر پێیانە یەو ، داوای لێبوردن دەکەم کە نـەمتوانیوە بـە تـەواوی (بەبالاگـەردانی) بـــالا بــەرزو جوانەکـــەی دەقەکە بم و ، چونکە هێند شاکارێکی مەزن و بەرینە .. شایانی ئەوەیە هەرچی قەڵەمی نووســەران هەیـــە لـــەمیحرابی پـــیرۆزیدا دەستەونەزەر بن !! )

کە بـە پێچەوانەیشـەوە ، گـەلێ ڕۆمـانی کوردیمـــان هـــەن ، دەبوایـــە ئاوڕێکیـــان لێبرایەتـــــەوەو ، بـــــە ویژدانـــــەوە هەڵبسەنگێنرابان ، کە چی بـە بێدەنـگ بـە لاماندا تێپەڕین .

بۆیـێ دووبـارە دەیڵێمـەوە .. بـۆ ئـەوەی ئـەم دیـاردەی بـە لێشـاوییە نیسـبییەی کوردی ئەم دوو ساڵەی دواییمان ، نەوا بە بێدەنگی و نەوا بـە شاباشـکردنی بۆشـەوە تێنەپەڕن .. پێشنیاز دەکەم .. فێستڤاڵێکی وا ساز بکەین لە ئاستی دیاردەکەدا بێت ، تێیــدا بــە وردیو بــە ویژدانــەوە هــەموو (ئەزموونــەکان) بــە چــاك و خراپــەوە .. هەڵســـــەنگێنین .. یـــا (خوێندنــــەوەی) ڕاستەقینەی جۆراوجۆرمان بۆیان هەبێت و، لە هەمان کاتیشدا دیالۆگێکی گەرم و گوڕ لـە مـەر ئاسـت و لایێنـەکانی ئـەم هونـەرە شارســـتانێتی و ڕۆشـــنبیرییە فراوانـــە بخەینـــەوەو لەگـــەڵ خـــاوەن ئـــەزموون (ڕۆماننووس) ەکاندا ڕووبەڕوو ببینـەوە .. نهێنییێکـــانی کـــارکردن و پرۆســـەی ئەفراندنەکان ئاشکرا بکەین و ، هەرێیکەیان جێی شیاوی خۆیان بگرن .. یان هەر هیچ نەبێت بتوانین لەو فێستڤاڵەدا لایەنـە بـە هـــێزو پـــێزو جوانـــەکانی ڕۆمانـــەکان بخەینەڕوو .. تا هاندەر و ڕینمایی بێت بۆ کارەکـانی داهاتوویـان ئـەوەی شـایانی وەرگـێران بـوو ، یـا بـۆ زمـانـەکـانی دی تەرجەمـەیان بکـەین و نیشـانی گـەلانی دیکـەی بدەیـن .. لـە هـەمان کاتیشـدا ئـەو ڕۆماننووسـانەیش لـە یـاد نەکـەین کـە لەمەوبەر جێدەستی ڕەنگینییان لەم بوارەدا هـەبووە .. تـا ئـەم هونـەرەیش شانبەشـانی هونـەرەکانی دیکـەمان ، ڕەوتـی دروسـتی خـۆی وەربگرێـت و ، بـە شـێوازی نـو یۆو ستاتیکای سەردەمانەی ڕۆمانی جیهانیش موتوربـە بکرێـت و ، لـە کاروانەکـە دوا نەکەوین !

# حەقیقەت، شێوەکان، واقیع لەنمایشی مەوجود ساماندا

هۆشەنگ شێخ محەمەد – راوێژ هیرانی

(١)

شێوەکان، دەق، مەوجود سامان، رامان ژمارە(٢٤)، لاپەرە (١٣٠) بڵاوکراوەتەوە.

(٢)

"دەستم کە برۆیبایە خودا ئاسایی
گەرلونی ترم دەخستە رو سانایی"(١)

خەیام، دەنگێکە وەك کۆڵن ولسن دەڵێت‌باس لە هەڵوەشانەوەی دونیاو دروست کردنەوەی دەکات بەشێوەیەک کە زۆر نزیکتربێت لە ئارەزووەکانی دڵ (٢).

خولّقاندنەوەی‌د ونیاش لەنمایشی شێوەکانی (مەجود ساماند)دا دەنگێکی دیکەیە لەم بوارەدا، کە زۆر کەم توانیویانە لێی بدوێن یان باسی بکەن..، گەڕان بەداوی شێوەیەکی دیکە بۆ وجود، شێوەیەك کە ئاوێنەی وجود بێت.. شێوەیەك حەقیقەت و راستگۆیی لەخۆوە بگرێت لەبەرامبەر بێ بایەخی دونیای واقیعی بەو چەمکە دینی‌و سیاسی‌و رۆشنبیری‌و ئەخلاقیانەی کە هەن.

(٣)

ئەگەر خەیام بەویستی خۆی مومارەسەی ئەو شێوە ژیانە دەکا کە ئەو خۆی دەیەوێت و باوەڕی پێیەتی و بەراستی و حەقیقەتی دەبینێتەوەو بەهایەکی پێدەبەخشێ، ئەوا مەوجود سامان هێشتانە کە لەسەرەتای گەڕان و نیازدایە بۆ خولّقاندنی ئەو شێوەیەی ئەو پێی حەقیقەت و راستیە، تا بیداتە شێوە شێواوەکانی واقیعەکەی.

**(شێوەیەك نیازمە)** (٣)

**شێوەكانی مەوجود راگەیاندنی ئەو بوونەیە كە ئەو نیازیەتی بیبەخشێتە دونیا، لای خەیام پتر مومارەسەی شێوەیەكە لە بوون، جیاوازی راگەیاندن و مومارەسەش وەك رێبین ئەحمەد هەردی دەڵێت (چۆنایەتییە، مومارەسەی پرۆژەی ئەو كائینەیە بوونی خۆی مسۆگەر كردوە، لەكاتێكدا - راگەیاندن - پرۆژەی ئەو كائینەیە لەبوونی خۆی بەگومانە)** (٤)

(٤)

**گۆڕینی شێوەكان، خولقاندنەوەی سەر لەنوێ پەیوەندییەكی هۆشیارانەی نوێیە لەنێوان مەعریفەو وجوددا، شاعیر دەیەوێت تەفسیرێكی نوێمان بداتێ بۆ چەمكەكانی بوون.. بۆ ئەوەی بەشێوەیەكی دیكە سەرەدەری لەگەڵ بكەین و پەیوەندییەكی هۆشیارانەتر، عاقڵانەتر لەگەڵ وجوددا ببەستین.**

**پرسیار دەكەین، كە ئایا شاعیر لەگۆڕینی بۆ نموونە - وڵات - بۆ تاراوگە - دەشێت تاراوگەش ببێتە وڵات - ئایا لێرەدا هەمان رەهەندەكانی وڵات و تاراوگە دووبارە بینا دەكاتەوە؟**

**یان دەیەوێت پەیوەندییەكی دیكەی نوێ لەنێوان خودێكی بەگومان و وێڵبەداوی نیشتمان و ئارامیدا بدۆزێتەوە لەگەڵ واقیعی ئەو وڵاتەی لەحەقیقەتدا تاراوگەیە؟**

**هەڵوەشانەوەی چەمكەكانی بوون لەدابەشكردنە دووانەییەكانداو دەربازبوون لەو دابەشكردنە غەیبیانەی زمانی كوردی تا ئێستا پیایدا هەڵدەلێ و گیرۆدەیەتی لەشێوازە قەدەرییەكاندا.. لەشێوەكەییو دەستە مۆو نەگۆڕاوو پیرۆزەكاندا، ئاسۆیەكی مەعریفی نوێ دەكاتەوە كە تا ئێستا لەنێو زۆربەی دەقەكاندا ونە،**

**ئیدی كە وڵات... تێبگا تاراوگەیە، هەر دیدارێ ئاشنابوون نییە، باران ببێتە چەترو... باقی وێنەكانی دیكەی ناو دەقی شێوەكان.. ئەمەیان یەكێكە لە خەسڵەتەكانی هونەری نوێخواز، كەوەك (د. زكريا ابراهيم) بۆی دەچێت( لەهونەردا هەمیش گولزتنەوەیەكی ئاشكرا هەیە لەجیهانی قەدەر یان یان چارەنووسەوە بۆ جیهانی وشیاری و هزر كردن)(٥).**

(٥)

دەربازکردنی وجود لەو بێ مانایی‌و بێ بایەخییەی تیایدایە، دیدی شاعیرە کە لەشێوەکان بەرجەستەی دەکات، کولن ولسن دەڵێ:(لا مونتەمی سەبارەت بە دەرەوەی کێیە؟ لەکۆتاییدا ئەو لەدەرەوەی کۆمەڵ و دین و مرۆڤایەتی نییە، بەڵکو لەدەرەوەی پێوەری بەهاکانی " زەرورەت و پێویستیە"، و ئەلێرەدا ئامانجی نیتشە بەرجەستە دەبێ کەرایدەگەیێنێ: دەرهاوێشتنی بەهاکان لەسنووری بەهاکانیان)(٦).

ئەو هەوڵەی مەوجود سامانیش دەرهاوێشتنی شێوەکانە لەسنووری شێوەکانیان، واتە بەخشینی رەهەندی نوێیە بەشێوەکان، هەر بۆ نموونە :

شێوەیەك دەبەخشمە عیشق

کەمەرج نییە هەمیشە یەکێکت خۆش بوێ (٧)

یان:

شێوەیەك دەبەخشمە جەنگ

کەژیانیش بەشدارە لەفەنابوونی شتەکان (٨)

لەم دێرەشدا وتەیەکی (فرید)مان بیر دێنێتەوە کە دەڵێت: زاوزێ سەرەتای مردنە)(٩) کە تەعبیر لە خوێندنەویەکی مەعریفی دەکا بۆ بوون و فەنابوون.

(٦)

مەبەست لەگۆڕینی شێوەکاندا، گوازتنەوەیە لەدلالەتە سلبییەکانەوە بۆ دەلالاتی ئیجابی، بەم گواستنەوەیە، شاعیر دەیەوێت شێوەیەکی هێورو جوان و ئاواەدانی و لەزەت و ئاشنا بوون و ئومێدو بەختەوەری بەوجود بێت و بوونی بە - دەلالەتە ئیجابیەکانەوە - مسۆگەر بکات. داخوازی کردنی ژیانێك لەگەڵ ویست و حەزەکانی دڵ بگونجێت، دەربازکردنی مرۆڤایەتییە لەو قەیرانە مەزنانەی تێی کەوتووەو.. کۆتایی هێنانی ئەو مانا بێزەوەرانەیە کە دەسەڵاتەکانی دینی و سیاسی‌و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیریە سواوەکان لەرەوتی مومارەسەکردنی خۆیاندا لەسەر حسێبی حەزو ویستەکانی مرۆڤ دەریدەهاوێژن.

مانای چەمکەکان، لەلای شاعیردا پێچەوانەی ئەو تێگەیشتنانەیە کەدسەڵاتەکان سەپانوویانە بەسەر مرۆڤدا، ئەگەر نسکۆ لەعەقڵیەتی دەسەڵاتدا بێ شکۆ بێت و کاولکردن و وێرانی بەدواوەو بێت، ئەوا بەلای شاعیر، نسکۆ.. شکۆیەکی هەیەو

دەکرێت بیکاتە پەیکەری ئاوەدانی.. هەروەك چۆن چەمکەکانی جوانیو دەنگ و رەنگ و مانـاو لـەززەت و سـەفەرو بـاران و مێـژوو ئـایندەو خـواو ئـاگرو جـەنگ و ژیـان و بێدەنگی و فرین و خنکان و هتد، لەلای شاعیردا ماناو رەهەندەی دیکەی جیایان لێ بەرهەم دەهێنێت کە دوورن لەتێگەیشتنی باووکەیی.

ئەمەیان هەوڵێکە بۆ گەران بەدوای حەقیقەتێکدا کە شاعیر وەفادارە بۆی و هەوڵ دەدا لەناو ئەم حەقیقەتەدا مومارەسەی بوونی خۆی بکـات، بوونێـك کەبەختـەوەری دەکات و ویستەکانی جێبەجێ دەکات و شەرەفی مرۆڤایەتی پێدەبەخشێتەوە!

(٧)

ئەگـەر سـەرنج لەبابـەتی شـێوەکانی بدەیـن، دەبینـین بەسـەر چـەند چـەمکێکی جۆراوجۆر دابەش دەبن لەوانە: سروشت، دین، رۆشنبیری، نیشتمان، ئایدیۆلۆژیا، دەسەڵات، ئازادی.. کات.. شوێن رووداو..

زمـانی دەربڕیـن و وشـەو موفرەدەکـانی بەشـداریيان کـردووە لەنمایشـی شـێوە چەمکەکان، بۆ نموونە سروشت بە: جوانی، کەنار، رەنگ، سێو، ئەستێرە، رێگا، باران، باخچە، هەتاو، مانگ، بڵندی. بەم وشانە خەلاقیەت و هێزو شیان و مۆسیقاو دونیای غەریزی و قانوونە تەبیعیەکانی سروشت نیشان دەدات، هەروەها زەمەنیش وەك شێوەیەك لەشێوەکان بەکۆمـەڵێ موفـرەدات تـەعبیری لێکـراوە(منداڵـی، ئێـوارە، رۆژەکان، شەوگار، مێژوو، سبەینێ)

کۆمەڵێ موفرەدەی کەلتوری دینی (کرۆنش بردن، گوناه، خیانەت، خواوەند،....... ئەم بۆشاییە تەعبیر لە (نوێژ) دەکات.

بەشێوەیەکی گشتی، مەبەستمان لە کۆکردنەوەی ئەم وفرەدانەو کۆمەڵێکی دیکەی وەك(مـامزە ئاڵتونییـەکان، شـیعر، مۆسـیقا، ئاهـەنگ، درەوشـانەوەکانم، کـەژاوە، کۆلکەزێرینە)

مەبەستمان دوو شتە:-

١- رۆمانسییەت و تەڕایەتی وشەکان.

٢- دەرنەچوونی وشەکان لەسنووری ماناکانیـان، بـەجۆرێك کـە شـێوەکان تـاك رەهەندانـە خۆيـان نمایش دەکەن، بـەجۆرێك شـاعیر نایـەوێ لـەبری وڵاتەکـەی، وڵاتێکـی دی خـەڵق بکـات، بـەڵکو تـەنیا دەخوازێت بەرگی وڵاتەکەی بگۆڕێت و شـێوەیەکی راسـتگۆو حـەقیقی پـێ ببەخشـێت کەلەگـەڵ فکـرو ویستەکانی ئەودا دەگونجێت.

ئەلێرەشدا خاڵێکی گرنگ ئاشکرا دەبێت لەفکری شاعیردا کە ئەویش ئەوەیە، ئەو رەفزی وڵات ناکاتەوە، بەڵکو رەفزی شێوەیەك لەشێوەکانی دەکاتەوە، چەمکەکانی دیکەش هەر بەو شێوەیە.

لەپاڵ زمانە رۆمانسی و تەڕەکەشیدا، مەسەلەیەکی دیکەی گرنگ خۆی ئاشکرا دەکات کە ئەویش ئەوەیە، مەوجود سامان بەدوای فکرەییکی شۆڕشگێڕی رۆمانسی دەگەڕێت، کە ئەو فکرەیە، ئەو شێوەیەیە کە تەعبیر لە شێوەی حەقیقەتی بوون دەکات. بەواتەی ئەوەی مەوجود دەسەڵاتەکانی بوونی قەبووڵە بەڵام بەمەرجێك دەسەڵاتێك بێت لەنسکۆکانیشدا شکۆیەك و سحری ئاوەدانی و سیماکانی شارستانیەتی پێوە بێت.

جێی سەرنجیشە قفڵدانی شیعرەکە، بەکلیلێکە لەدەستی شاعیر خۆیدا بووە، شاعیر دەیتوانی بەدەیان شێوەی دیکەش هەڵبژێرێت و لەشیعرەکەدا تەوزیفیان بکات و گەڵێ مەسەلەی دیکەش بورووژێنێت لەپاڵ ئەو مەسەلانەی کە وررووژاندوونی وەك دەسەڵات، ئازادی، عەدالەت، عەشق، وڵات، تاراوگە.. دەیتوانی هەر بۆ نموونە: خۆکوشتن، فریشتە، خەون، ماچ ئاوێتەبوون، جیابوونەوە..هتد. بەمانە زیاتر هەستی خوێنەر هۆشیار بکاتەوە، بەڵام سەرئەنجامیش هەر دەگەیشتەوە کۆتاییەکی داخراو، چونکە هەموو وێنەکان بەشێوەیەك لەشێوەکان یەك پەیام رادەگەیێنن.

## ژێدەر


١. چوارینەکانی خەیام، وەرگێڕانی هەژار، سروشت تهران ١٣٧٠.

٢. کولن ولسن، فن الرواية، ترجمة محمد درويش، دار المأمون، ١٩٨٦، ص ١٩٥.

٣. رامان، ژمارە ٢٤، ل ١٣٠.

٤. رەهەند، ژمارە ٥، ١٩٩٨، ل١٥٦.

٥. مجلةالهلال، ص ١٣٩. بەداخەوە ژمارەو ساڵی دەرچوونی دیار نەبوو.

٦. كولن ولسن، المعقول واللامعقول في الادب الحديث، دار الاداب، الطبعة الرابعة ١٩٧٨، ص١٣٨.

٧. رامان، ژمارە ٢٤، ل١٣٠.

٨. هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٩. سيغموند فرويد، الحرب والحضارة والحب والموت.

# چەند نهێنییەک لە رێزمانی مۆرفیمی ئێستاییدا



د. شێرکۆ بابان

لە رێزمانی مۆرفیمی ئێستاییدا، ئێمە خۆمان زۆر هیلاک کردووەو مۆرفیمەکەش زۆر نهێنی زمانەکەی دەرخستووە بۆمان. لە ئەم روانگەیەوە، لەساڵی ۱۹۹۷دا کتێبێکمان بلاو کردەوە بەناونیشانی (میکانیزمە بنەڕەتییەکانی رستەسازی: رێزمانی بوون هەبوون)[١]. لە ئەم کتێبەدا بەوردی و بەهێوری و بەکەرەستەی کاری (بوون) و (هەبوون) بۆ میکانیزمە بنەڕەتییەکانی زمانەکە گەڕاوین. پاشان کتێبێکی ترمان، هەر لەهەمان ساڵدا، بلاوکردەوە بەناونیشانی (دانامیزمی جێناوی لکاو لەرستە سازیدا)[٢]. لە ئەم نووسنەشدا هەر باسی رێزمانی (بوون و هەبوون) و باسی (مۆرفیمی ئێستایی) کراوە. لەلایەکی ترەوە نووسینێکمان بلاو کردەوە لەسەر (رێزمانی مۆرفیمی ئێستایی)[٣] و پوختەیەکمان دەرکردەوە لەکتێبەکان و رێزمانی ئەو مۆرفیمەمان خستبووە نێو چوار چێوە. لەگەڵ هەموو ئەوەشدا، نووسینێکی ترمان بلاوکردەوە لە گۆڤاری (کاروان)دا، لە ژێر ناوی (دەنگی کپ لەزمانی کوردی)دا[٤]. لە ئەو بەرهەمانەدا بەوردی باسی مۆرفیمەکە دەکەین و لەنێرەشدا هەمان زانیاری و هەندێک زانیاری نوێ دووبارە دەکەینەوە، بەلام بایەخ بە نهێنییەکانی (مۆرفیمی ئێستایی) دەدەین. لە ئەم نووسینەشدا بەهیواین توانیبێتمان چشتێکی نوێ و روون کردنەوەیەکی بەهێزتر بخەینە سەر بابەتەکە. ئەو بابەتەی کە زۆر زۆر بێ خزمەتە لەرێزمانی زمانەکەدا. لەگەڵ ئەوەشدا رەنگە بابەتەکە بێ بایەخ بێت لەلای کەسانی تر بەلام لەلای ئێمە زۆر زۆر گرنگەو نەخشە زانستییەکانی زمانەکە دەدۆزێتەوەو زمانەکە دەکات بەسیستەمێکی رێزماندارو یاسادار. هەر لەبەر ئەوە ویستمان بلاوی بکەینەوەو بیخەینە سەر رەفەکانی مێژوو، تا ئەو رۆژەی لێی تێدەگەین.

### ١- هەڵگرتنی دەنگی کپ :

ئێمە لەهەموو نووسینەکاندا باسی ئەوە دەکەین کە مۆرفیمی ئێستایی (ـە)، دەنگێکی کپ، لەچەشنی (ت)[٥]، هەڵ دەگرێت. واتە، روخساری رەسەنی ئەو مۆرفیمە بریتییە لە (ـەت) لەناخی بیردا[٦]. بۆ ئەم مەبەستە چەندین ئەندازەی سەلمێنەر بەکار هێنراوە. لە ئێرەشدا، بەشێوەیەکی تر باسی ئەو دەنگە کپە دەکەینەوە:

یەکەم/ لە رانەبردووی کاری (بوون)دا،دەگوترێت:

ئازاد برا یـ (ـە)

بەڵام دەتوانین جێناوێکی خاوەنێتی بەکار بهێنین، وەک (م):

ئازاد برای منە ←——— ئازاد برا (م) (ـە)

بەڵام ئەگەر جێناوی (ی) بەکار هات، وەک:

ئازاد برای ئەوە ←——— ئازاد برایەتی[٧]

ئەوا جێناوەکە دەبێت بەیاسا بەزێن و لەجێی هەندەسی خۆی دەترازێت و دەچێتە پاشەوەو بەراستەوخۆیی دەخشێت لەمۆرفیمەکە. لە ئەم کردەوەیەدا، دەنگە کپەکە زیندوو دەبێتەوە بۆ ناوگرایەتی بە ئەم چەشنە:




لە ئێرەدا، دەرکەوت کە رێژەی کاری بوون (ـە)، کە بریتییە لە مۆرفیمی ئێستایی، دەنگی (کپی) (ت) هەڵ دەگرێت.

دووەم/ لە رێژەی وەرچەرخاوی کاری (بوون)دا، دەتوانین کاری (هەبوون) کە هاورێزمانە لەگەڵ (بوون) وەربگرین، وەک:

ئەو هەیـ (ـە)

پاشان، ئەگەر رێژەکە وەرچەرخێنرا[٨] بەسەر کەسی یەکەمی تاکدا، ئەوا رێژەکە دەبێت بە:

من هە (م) (ـە)

بەڵام ئەگەر وەچەرخێنرا، بەسەر جێناوە یاسا بەزێنەکەی کەسی سێیەمی تاکدا، ئەوا جێناوەکە (ی) لە جێی هەندەسی خۆی دەترازێت و بەراستەوخۆیی دەخشێت لەمۆرفیمەکەو ڕێژەی (ئەو هەیەتی) پەیدا دەبێت کە بە ئەم چەشنە شیتەڵ دەکرێتەوە لەسەر باری ستوونی:

* ئەو : بکەری جودا لە رستەکەدا.
* هە : پارچۆلکەی کاری (هەبوون).
* یـ: ناوگری نێوان هەردوو بزوێنی (ـە).
* ـە : مۆرفیمی ئێستایی دانیشتوو لەجێی (بەرکار).
* ت : دەنگی کپی بووژاوەوە لەمۆرفیمەکەدا.
* ی : بکەری لکاو لەرستەکەدا [٩] (جێناو).

سێیەم/ لە رابردووی تەواوی تێ نەپەڕدا، مۆرفیمەکە تەنها هەر لەکەسی سێیەمی تاک دا دەردەکەوێت کەنادیارە، وەک:

ئەو ڕۆیشتووە + ەوە ← ئەو ڕۆیشتووە (ە ت) ەوە

لە ئەم رستەیەدا، کاتێک کە بزوێنە رووتەکەی پاشگری (ەوە) دەهێت، دەنگە کپەکە زیندوو دەبێتەوەو ئاشکرا دەبێت.

چوارەم/ لەرابردووی تەواوی تێپەڕدا، مۆرفیمەکە لەجێی بەرکاری نادیار دادەنیشێت و کاتێک کەدەخشێت لەبزوێنێک، دەبووژێتەوە، وەک:

ناردوو (م) (ـە) + ەوە ← ناردوو (م) (ـەت) ەوە

بە ئەم چەشنە دەبینین کە لە هەر چوار رووبەرەکەدا، مۆرفیمەکە دەنگی کپی (ت)ی هەڵگرتووە.

ئەم راستییە زۆر ئاشکرایە و ئەمەش یەکێکە لەنهێنییەکانی زمانەکەو لەنهێنییەکانی مۆرفیمی ئێستایی.

## ٢- مۆرفیمەکە بەداپۆشراوی:

لەیەکێک لەبنەما زانستییەکاندا، ئێمە دەڵێین:

[لە ژێر هەر جێناوێک لەپۆلی یەکەم مۆرفیمی ئێستایی هەیە بەداپۆشراوی] [١٠]

بێگومان ئەم بنەمایە دوو رووبەر دەگرێتەوە. یەکەمیان رووبەری (رانەبردووی تەواو)، واتە رێزمانی رانەبردووی (بوون و هەبوون). دووەمیان رووبەری رابردووی تەواو.

سەبارەت بەداپۆشراوی، لە ئەو ریزە جێناوەدا [م، یت، ـە، ین، ن، ن]، راستییەک هەیەو ئەویش ئەوەیە، کە لەژێر هەر جێناوێکدا مۆرفیمی (ـە) هەیە بەڵام دەرکەوتنی لەکەسی سێیەمی تاکدا، هی ئەوەیە کە جێناوەکە نادیارە لە ئەوێدا، وەک:

| | | | |
|---|---|---|---|
| ـە | م | ← | م |
| ـە | یت | ← | یت |
| (ـە) | - | ← | (ـە) |
| ـە | ین | ← | ین |
| ـە | ن | ← | ن |
| ـە | ن | ← | ن |

لە ئەو نەخشەیەدا، ئەگەر لەلای راستەوە سەیری خشتەکەی لای چەپ بکەین، ئـەوا مۆرفیمەکە لەکەسی سێیەمی تاکدا دەردەکەوێت چونکە جێناوەکە نادیارەو لەپێنج کەسەکەی تردا دادەپۆشرێت.
ئەمەش چەند بەڵگەیەکە بۆ ئەم راستییە.:

یەکەم/ دەرکەوتن لە جێی جێناوی نادیار (بکەر):

وەک باسکرا لەکەسی سێیەمی تاکدا جێناوەکە نادیارەو مۆرفیمەکە دەرکەوتووەو روخساری پۆلە جێناوەکە بووە بە [م، یت، ـە، ین، ن، ن]

دووەم/ دەرکەوتن لەجێی جێناوی نادیار (بەرکار):

لە ئەو رستە وەرچەرخاوانەی کاری (هەبوون)دا کە ئەو پۆلە جێناوە دەبن بە (بـەرکار)، دەتوانین بەرکارەکە بکەین بە (بەرکاری جودا) بۆ ئەوەی مۆرفیمەکە دەربکەوێت، وەک:

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ئەوان | هە (یان) | (م) | ← | ئەوان | من(یان) | هە یـ (ـە) |
| ئەوان | هە (یان) | (یت) | ← | ئەوان | تۆ(یان) | هە یـ (ـە) |
| ئەوان | هە (یان) | (ـە) | ← | ئەوان | ئەم(یان) | هە یـ (ـە) |
| ئەوان | هە (یان) | (ین) | ← | ئەوان | ئێمە(یان) | هە یـ (ـە) |
| ئەوان | هە (یان) | (ن) | ← | ئەوان | ئێوە (یان) | هە یـ (ـە) |
| ئەوان | هە (یان) | (ن) | ← | ئەوان | ئەمان(یان) | هە یـ (ـە) |

بەئاشکرا دیارە، کە لەکەسی سێیەمی تاکدا لەهەردووبارەکەدا مۆرفیمەکە دیارە، چونکە هیچ نییە کەدایبپۆشێت. لەبەرانبەردا، لەپێنج کەسەکەی تردا بەلاچوونی جێناوە لکاوەکان مۆرفیمەکە دەرکەوتووە. واتە، ئەو مۆرفیمە حەشاردراوە لەژێر ئەو پێنج جێناوە دیارەدا.

سێیەم/ دەرکەوتن بەلابردنی جێناوە لکاوەکان:

لە رابردووی تێپەڕدا کاتێک کە ریزە جێناوەکە دەبن بە (بەرکار) تەنها هەر لەکەسی سێیەمی تاکدا مۆرفیمەکە دەردەکەوێت. بەڵام لە پێنج کەسەکەی تردا، لابردنی جێناوەکان دەبێت بەهۆی دەرکەوتنی مۆرفیمەکە وەک:

ئەوان ناردوو (یان)(م) ← ئەوان من(یان) ناردوو (ە)
ئەوان ناردوو (یان)(یت) ← ئەوان تۆ(یان) ناردوو (ە)
ئەوان ناردوو (یان)(ـە) ← ئەوان ئەم(یان) ناردوو (ە)
ئەوان ناردوو (یان)(ین) ← ئەوان ئێمە(یان) ناردوو (ە)
ئەوان ناردوو (یان)(ن) ← ئەوان ئێوە(یان) ناردوو (ە)
ئەوان ناردوو (یان)(ن) ← ئەوان ئەمان(یان) ناردوو (ە)

**چوارەم/ دەرکەوتن بەگۆڕینی پۆلە جێناوەکە:**

ـ لەزاری گەرمیاندا، جێناوەکانی [م، یت، ـــ، ین، ن، ن] پێویست نین چونکە هەر پۆلی دووەم وەردەگرین بۆ بەرکار، وەک [م، ت، ـ، مان، تان، یان]. هەر لەبەر ئەوە لە ئەو ڕیزەدا مۆرفیمەکە دەردەکەوێت بەهەموو ڕستەکانەوە و بەهەر شەش کەسەکەوە، وەک:

| زاری کوێستان | زاری گەرمیان(۱۱) |
|---|---|
| ئەو نە (ی) ناردوو (م) | ئەو نە (م)ی ناردوو (ـە) |
| ئەو نە (ی) ناردوو (یت) | ئەو نە (ت)ی ناردوو (ـە) |
| ئەو نە (ی) ناردوو (ـە) | ئەو نە (ـــ)ی ناردوو (ـە) |
| ئەو نە (ی) ناردوو (ین) | ئەو نە (مان)ی ناردوو (ـە) |
| ئەو نە (ی) ناردوو (ن) | ئەو نە (تان)ی ناردوو (ـە) |
| ئەو نە (ی) ناردوو (ن) | ئەو نە (یان)ی ناردوو (ـە) |

بەئاشکرا دیارە کە زاری گەرمیان بەتەواوی دەرباز بووە لە پۆلی یەکەم لەجێناوەکان و مۆرفیمەکە لە داپۆشراوی ڕزگار بووە. ئەمەش بەڵگەیەکە بۆ هەبوونی مۆرفیمەکە لە ژێر ئەو ڕیزە جێناوەدا. لەگەڵ هەمو ئەوەشدا سەرنجێکی تر ماوەو ئەویش ئەوەیە کە هەردوو زارەکە گەیشتوونەتەوە بەیەک لەکەسی سێیەمی تاکدا کە گوتراوە:

ئەو نە (ی) ناردوو (ـە)

لەڕاستیدا ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە جێناوەکەی (بەرکار) نادیارە. لە ئەم ڕوانگەیەوە جێناوەکە چی نادیار بێت و چی لابرابێت هەر مۆرفیمەکە ڕزگار دەبێت. ئەمەش وا دەکات لەجیاوازییەکە نەمێنێت. یان دەتوانین بڵێین لەهەر پۆلە جێناوەکەدا، جێناوی (بەرکار) هەر نادیارەو مۆرفیمە هەر بەیەک میکانیزم ئاشکرا دەبێت.

**٣- بووژاندنەوەی مۆرفیمەکە:**

لە رابردووی تەواوی تێنەپەڕدا، دەگوترێت:

من گەیشتوو (م) (ـ)[١٢]

یان، من گەیشتوو (م) (ـە)

بەڵام لە رێژەی تێپەڕدا، هەر دەگوترێت:

من گەیاندوو (م) (ـە )

واتە، رستەی تێ پەڕ، ئەوە پەسند ناکات کە مۆرفیمەکە لاببرێت لەجێی بەرکارە نادیارەکە. بۆ نموونە، ناگوترێت (من گەیاندووم). لە بەرانبەردا، رستە تێ نەپەڕەکە مۆرفیمەکە هەڵ ناگرێت بەڵام ئەگەر بکرێت بەسەربار پەسەندی دەکات.

لە ئەم رووەوە ئێمە لە ئەو باوەڕەدابووین کەلەرستە تێنەپەڕەکەدا بەهەڵە دانرابێت، کەچی واش نەبوو. مۆرفیمەکە لەژێرهەر پێنج جێناوەکەدا هەیە بەڵام هەر لەکەسی سێیەمی تاکدا دەرکەوتووە، وەک:

ئەو گەیشتوو (ە)

لە ئێرەدا، ئەگەر بەوردی روو بکەین لەبابەتەکە، دەبینین هەر پێنج کەسەکەی تر ئەوە پەسەند دەکەن کە مۆرفیمەکە دەربکەوێت، وەک:

من گەیشتوو (م) (ـ) ← من گەیشتوو (م) (ـە)

تۆ گەیشتوو (یت) (ـ) ← تۆ گەیشتوو (یت) (ـە)

ئێمە گەیشتوو (ین) (ـ) ← ئێمە گەیشتوو (ین) (ـە)

ئێوە گەیشتوو (ن) (ـ) ← ئێوە گەیشتوو (ن) (ـە)

ئەوان گەیشتوو (ن) (ـ) ← ئەوان گەیشتوو (ن) (ـە)

ئەم کردەوەیە دژ ناراستەیە لەگەڵ نووسینەکانی ئێمەدا چونکە وا هەست کراوە کە تەنها هەر دوو رێگا هەبێت بۆ ئاشکرا کردنی، وەک:

رێگای یەکەم: بەبوونی جێناوەکە بە (نادیار)، وەک لەکەسی سێیەمی تاکدا هەیە.

رێگای دووەم: وەک لابردنی جێناوە لکاوەکەی(بەرکار) بەدانانی جێناوێکی جودا، وەک:

من گەیاندوو (م) (یت): من تۆ (م) گەیاندوو (ە)

بەڵام لە ئێرەدا، رێگایەکی سێیەم هەیە کە بریتییە لەخشاندنی جێناوەکە لە ڤاولێکی رووت. بێگومان جۆرە ڤاوڵی ئاوها رووی ئەوەی نییە کە بگاتە سەر لێوان، تا دەنگێکی (نەبزوێن) پەیدا نەکات بۆ بڕگە ناتەواوەکەی، وەک:

من گەیشتووم + دوە ← من گەیشتوو (م) (دوە)

لە ئێرەدا، رەگەزی (ەوە) ئالآوە بەجێناوەکەوەو برگە کە پڕ بووەتەوە بەلآم رستە بێ رەنـگ و بۆیـە و دەڵێیت زۆری لێ کراوە، لەبەرانبەردا، ئەگەر گوترا:

من گەیشتوو (م) (ـەت)[١٣] (ەوە)

باری رستەکە راستتر دەبێتەوە. هەر لەبـەر ئـەوە زمانەکە خۆی خۆی راست دەکاتـەوەو مۆرفیمی ئێستایی (ـە)دەردەهێنێت و دەنگە کپەکەی دەبووژێنێتەوەو بەروخساری (ـــەت) دەی خاتە ریـزەوە بە زەبری بزوێنەکە، وەک:

ئێمە گەیشتوو (ین) (ـەت) (ەوە)

ئێوە گەیشتوو (ن) (ـەت) (ەوە)

یان، لەگەڵ ئامرازی (ـە)دا دەردەکەوێت، وەک:

تۆ گەیشتوو (یت) (ـەت) ـە ئەوێ

ئەوان گەیشتوو (ن) (ـەت) ـە ئەوێ

یان، لەگەڵ ئامرازی (ێ) دەردەکەوێت، وەک:

من گەیشتوو (م) پێی ←——— من گەیشتوو (م) (ـەت)ێ

تۆ گەیشتوو (یت) پێی ←——— تۆ گەیشتوو (یت) (ـەت)ێ

بە ئەم چەشنە دەبینین کە قاولەکە کلکی دەنگی کپی (ت) دەگرێت و دەی دۆزێتەوە بۆ ناوگرایـەتی و لـە ئـەم کردەوەیەشدا مۆرفیمەکـە بەروخسـاری تـەواوی (ـــەت) خـۆی ئاشـکرا دەکـات. لـە ئـەم دیاردەیەش دا لاسارییەک هەیەو ئەویش ئەوەیە کە پۆلە جێناوەکە هەیە لە ریزەکەدا و مۆرفیمەکـەش دیارە لەهەمان ریـزدا. ئەمـەش دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەو راسـتییەی کـەدەنگی بزوێـن زۆر بـەهێزەو هـەموو شـانەکانی نـاخی بـیر دەگـەڕێت بـۆ ئـەوەی دەنگێکـی نـەبزوێنی رەسـەن پـەیدا بکـات، تـا بتوانێـت بـەردەوانی بـەتوونێلی زاردا تـێ بپـەڕێت و سـنووری رۆخـی لێـوان بـبەزێنێت. ئەگـەرنا، چـۆن ئـەو مۆرفیمەی دۆزییەوەو بیرو بۆچوونەکەی ئێمەی راست کردەوە، کە خۆمان شێواندبوومان.

## ٤- مۆرفیمەکە لە زاری گەرمیاندا:

لەزاری گەرمیاندا، هەمان ریزە جێناوی پۆلی دووەم [م،ت، ی، مان، تان، یان] وەردەگێررێتـەوە بۆ (بەرکار) لە رابردوودا. واتە پۆلی دووەم دەبێت بە (بکەر) و دەبێت بە(بەرکار) لەهەمان رێژەدا. لـە ئەم کردەوەیـەدا، جێنـاوی کەسی سێیەمی تـاک لـە رۆڵـی بـەرکاردا دەبێـت بـە(نادیـار) و ریزەکـە دەبێت بە [م، ت، ـ، مان، تان، یان]. ئەمـەش ئـەوە دەگەیـەنێت کـە ریـزە جێنـاوی پـۆلی یەکـەم [م، یت، ین، یـن، ن، ن] لـە رێژەکـەدا نـامێنێت تـا مۆرفیمەکـە داپۆشێت. هـەر لەبـەر ئـەوە مۆرفیمی ئێستایی (ـە) لەگەڵ هەموو رێژەیەکی رابردووی تەواوداو لەگەڵ هەموو رێژەیـەکی رانـەبردوو کـاری (بـوون و هـەبوون)دا، دەر دەکـەوێت. واتـە، نەکـەس و نـەژماردکی کـەس و نـە بـەرکاری لکـاو و نـە

بەرکاری جودا، ناتوانن ئەو رەگەزە بشارنەوە. لە ئێرەدا دەبێت هەڵوەستەیەک بکەین و بزانین بۆچی ئەو پۆلە جێناوە ناتوانێت مۆرفیمەکە دابپۆشێت وەک جێناوەکانی پۆلی یەکەم. لەوەڵامدا، دەتوانین بگەڕێینەوە بۆ باری خانە ریزی، کەمۆرفیمی ئێستایی (ـە) لە خانەی [ـ٧]دا دادەنیشێت لە ژێر پۆلی یەکەمدا، بەڵام لەزاری گەرمیاندا هەردوو جێناوەکەی (بکەرو بەرکار) بەیەکەوە لەخانەی جێگۆڕی [ـ٦]دا دادەنیشن. کەواتە وەک پۆلی دووەم لەخانەی [ـ٦]دایە ناتوانێت بارگەی خانەی [ـ٧] دابپۆشێت، مۆرفیمەکە لەزاری گەرمیاندا بەگشتی دەردەکەوێت و رزگار دەبێت لەداپۆشراوی. ئەمەش بەبێ گومان لەرابردووی تەواو و لە رانەبردووی کاری (بوون و هەبوون)دایە. ناوەڕۆکی ئەم نهێنییە لەخاڵی چوارەم، لەبڕگەی دووەمی ئەم نووسینەدا باس کراوە.

### ٥- مۆرفیمەکە کەس و ژمارە هەڵ ناگرێت:

لەخاڵی (٢)دا، ئەو راستییە سەلمێنرا کە مۆرفیمەکە لە ژێر هەر شەش کەسەکەدا هەیە و بەداپۆشراوی. ئەمەش نهێنییەک دەردەخات و هەندێک زانیاری راست دەکاتەوە، وەک:

یەکەم: مۆرفیمەکە رێژەی کەسی سێیەمی تاک نییە بۆ کاری (بوون). بەڵام رێژەی کاری (بوون) بەیەکسانی بۆ هەر شەش کەسەکەو بەهەمان شێوە روخسار.

دووەم: مۆرفیمەکە ناگەڕێتەوە بۆ کەسی سێیەمی تاک بەتەنها. واتە مۆرفیمەکە سیمای (کەسایەتی) هەڵ ناگرێت.

سێیەم: مۆرفیمە کە لەتاک و کۆ دا دەرکەوتووە. واتە لە ئێرەدا وەک کەس نییە ژمارەی کەسیش لەئارادا نییە.

بە ئەم پێیە چی گوترا وەدەربارەی (رێژەی کاری بوون بۆ کەسی سێیەمی تاک) هەمووی هەڵ دەوەشێتەوەو دەبێت بگوترێت رێژەی کاری (بوون) بۆ هەر شەش کەسەکەیە بەیەکسانیو بەبێ جیاوازی کەس و ژمارە.

## بەرهنجام و لێکدانەوە

لە رێزمانی مۆرفیمی ئێستاییدا چەند نهێنییەک هەیە، وەک:

**نهێنی یەکەم:** مۆرفیمی ئێستایی (ـە) هەر بەرواڵەت لەیەک دەنگی بزوێن لەچەشنی (ـە) پێک هاتووە. ئەو مۆرفیمە لەرەسەندا دەنگێکی کپ (Silent)، لەناخی بیردا، هەڵ دەگرێت لەچەشنی (ت). کەواتە روخساری رەسەنی مۆرفیمەکە بریتییە لە (ـەت). دەنگی یەکەم (ـە) دەنگێکی چالاک و گۆکراوە لە (ئاخاوتن)داو دەنگی دووەم دەنگێکی کپەو لە ژینگەی تایبەتیدا نەبێت ناهێتە سەر لێوان. ئەو ژینگە تایبەتییەش بریتییە لە (خشاندنی کلکی مۆرفیمەکە لەسەری بزوێنێک) بەراستەوخۆیی. لە ئەم روانگەیەوە چەند رەگەزێکی رێزمانی هەیە کەبتوانێت، بەپێی یاسا رێزمانییەکان، ئەو ژینگەیە رۆبنێت.

**نهێنی دووەم:** مۆرفیمی ئێستایی، ئەگەر هەبێت لە ریزەکەدا، بەجێناوی پۆلی یەکەم دادەپۆشرێت. واتە گۆناکرێت و دەرناکەوێت. لە ئەم رووەوە، چەند رێگایەک هەیە بۆ پەردەلادان لەسەر مۆرفیمەکە بەپێی یاساکانی رێزمان:

١. بەهەبوونی جێناوێکی نادیار بۆ کەسی سێیەمی تاک، وەک (بکەر) لە رستەی تێنەپەڕدا و وەک (بەرکار) لە رستەی تێپەڕدا. کەواتە، لەئەو دووبارەدا مۆرفیمەکە وەک چرایەک دادەگیرسێت.

٢. لەجێیەکدا، کەجێناوی پۆلی یەکەم بە جێناوی پۆلی دووەم جێگیر کرابێت، وەک لەزاری گەرمیاندا هەیە. لە ئەو بارەدا جێناوی داپۆشەر نامێنێت و مۆرفیمەکە ئاشکرا دەبێت.

٣. لە رێژەی رابردوو، رابردووی تەواوی تێپەڕدا جێناوە لکاوەکانی پۆلی یەکەم دەتوانن مۆرفیمەکە بشارنەوە بە داپۆشین. لە ئەم روانگەیەوە رێزمانی زمانەکە رێ ئەوە دەدات کە جێناوی لکاوی (بەرکار) بکرێت بەجێناوی (جودا). لە ئەنجامدا جێناوە لکاوەکە مۆرفیمەکە فەرامۆش دەکات و مۆرفیمەکە بەجوانی ئاشکرا دەبێت.

**نهێنی سێیەم:** لەنهێنی دووەمدا، بەکورتی گوتراوە، مۆرفیمەکە دەردەکەوێت ئەگەر جێناوەکە ریزەکە فەرامۆش بکات و لابچێت. لە ئێرەدا نهێنیەکە لە ئەوەدایە کە جێناوەکە دەتوانێت لەگەڵ مۆرفیمەکەدا دەربکەوێت لەهەمان ریزدا. ئەوەش لەبیر نەکەین کە لەنهێنی دووەمدا، یان جێناوەکە دیار بوو و یان مۆرفیمەکە دیار بوو. لە ئەم رووەوە، هەردووکیان بەجوانی بەیەکەوە دەردەکەون، وەک:

تۆ نووسراو (یت) (ـەت)ەوە

لە ئێرەدا جێناوی (ێت) لەپۆلی یەکەم و مۆرفیمەکە بەروخساری تەواو دەرکەوتوون. لە ئەم نموونەیەدا وەک ناتوانین بڵێین (تۆ نووسراویتەوە)، مۆرفیمەکە لەژێر جێناوی (ێت)دا داپۆشراوە. بەڵام کاتێک کەدەنگێکی (بزوێن)، لەچەشنی (ـە) دەخشێت لەکلکی رستەکە دەنگە کپەکە دەدۆزێتەوەو مۆرفیمەکە بەروخساری تەواو دەهێنێتە ریزی گوفتارەوە. کەواتە، هێزی (بزوێن) ئەوەندە گەورەیە دەتوانێت مۆرفیمەکە دەرباز بکات لەداپۆشراوی و ریزی بکات لەگەڵ جێناوە داپۆشراوەکەیدا. لە ئەنجامی ئەم نهێنییەدا دەردەکەوێت کە رێزمانەکە خۆی خۆی راست دەکاتەوەو لەئەوێدا ئەگەر مۆرفیمەکە خاوەنی رەسەنی دەنگە کپەکە(ت) نەبا ئەوا بەئاسانی بەداپۆشراوی دەمایەوەو نەدەبووژایەوە لەچاڵە نهێنیەکەیدا.

**نهێنی چوارەم:** زۆر لە رێزمانووسان ئەو مۆرفیمە لەگەڵ پۆلە جێناوی [م، یت، (ـە)، ین، ن، ن]دا ریز دەکەن. لەبەرانبەردا، ئەو رێزمانووسانە ئەگەر زاری گەرمیانیان بزانی با ئەوا لەگەڵ پۆلی دووەم دا [م، ت، (ـە)، مان، تان، یان] ریزیان دەکرد. نهێنی ئەم دیاردەیەش لە ئەوەدایە کە مۆرفیمەکە نە لە پۆلی یەکەمەو نەلەپۆلی دووەمەو مۆرفیمەکە رەگەزێکی سەربەخۆیەو لەخانەی

[ـ٧]دا دادەنیشێت، لەناخی بیردا، ئەو مۆرفیمە بەزەبری کاری (بوون) بزاڤی تەواوێتی دەخاتە نێو ڕێژەی رابردووی تەواوەوە و بەدوو ڕێگاش دەردەکەوێت. یەکەمیان بەلاچوون و لابردنی جێناوەکە لە ریزەکەدا، دووەمیان بەخشاندن لە بزوێنێکی رووت، (نهێنی سێیەم).

**نهێنی پێنجەم:** لەنهێنی چوارەم دا، گوترا کەمۆرفیمەکە سەربەخۆیەو بێ بەرییە لەهەردو پۆلە جێناوەکە. لە ئەم رووەوە، دەتوانین سەری نهێنییەکی تر هەڵبدەینەوەو بڵێین کە نە(کەس) و نە (ژمارەی کەس) هەڵ ناگرێت. سەبارەت بە (کەس) لەگەڵ کەسی یەکەم و دووەم و سێیەمدا دەرکەوتووە و سەبارەت بەژمارەی کەس، لەگەڵ کەسی (تاک) و (کۆ)دا هەر دەرکەوتووە. ئەمەش ئەوە دەردەخات کە ئەم مۆرفیمە بریتی بێت لەنهێنیەکی زۆر گەورەتر لە ئەوەی کەباس کراوەو کەباسی دەکرێت.

لەکۆتایی دا بەهیواین کە توانیبێتمان رووبەرێکی نوێ بدۆزینەوە لەکیشوەری فراوانی ئەم مۆرفیمە گرنگەدا. ئەو مۆرفیمەی کە دەتوانێت زۆر ئاسەوارو زۆر ماکی رەسەنی زمانەوانییانە بدۆزێتەوە لەکەلاوەی ئەو زمانانەدا کە بەزەبریساڵگار پەرپوت بوون. ئێمە لە ئەو باوەڕە داین کە ئەم مۆرفیمە چەندین نهێنی تر هەڵ دەگرێت بەتایبەتی لە ئەو نمونانەدا کە (گومان) و (نیاز) دەکەوێتە ژێر لێوی پێک هێنەری رستەکەوە. بەهیواین لەداهاتوودا زۆرتر رووبەری ئەم نووسینە بەرین بکەینەوە.

## پەراوێزەکان

١. سەرچاوەی ژمارە (١) لە سەرچاوەکاندا.
٢. سەرچاوەی ژمارە (٢) لە سەرچاوەکاندا.
٣. سەرچاوەی ژمارە (٣) لە سەرچاوەکاندا.
٤. لە ژمارە (١١٦)ی گۆڤاری کارواندا، ئەم وتارەم بلاو کردۆتەوە.
٥. لە ئەو وتاردا کە لەپەراوێزی (٤)دا ناوبراوە، بەوردی چەند ئەندازەیەک بەکار هێنراوە بۆ دۆزینەوەو ناسینەوەو بینینەوەی دەنگی کپی (ت) لە مۆرفیمی ئێستاییدا.
٦. لە نووسینەکانی ئێمەدا (سەرچاوەی ١، ٢)، ئێمە خانەی [ـ٧]مان تەرخان کردووە بۆ مۆرفیمەکە لەناخی بیردا.
٧. دکتۆر وریا عومەر ئەمین، برگەی (تی) بەمۆرفیمی بۆش دەناسێت. بەلاّم ئێمە لەگەڵ ئەو بیرو بۆچوونەدا نین (سەچاوەی ٥، ٦).

٨. بۆ میکانیزمی وەرچەرخان خوێنەر دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ سەرچاوەی (١، ٢) کە لە ئەوێ بەجوانی باس کراوە.

٩. ئەم جێناوە دەگەڕێتەوە بۆ پۆلی دووەم و رەفتارێکی یاسابەزێنەر هەڵ دەگرێت بەلاّم لە ژینگەیەکی زۆر وردو دانسقەدا.

١٠. لەسەرچاوەکانی (١، ٢، ٣)دا، بەوردی ئەو بنەمایە روون کراوەتەوە.

١١. زاری گەرمیان، رەنگە هەموو کەسێک هۆگر نەبێت لەگەڵیدا بەلاّم ئەم زارە زۆر رێزمانییەو زۆر خزمەتی رێزماننوس دەکات لەدیاری کردنی میکانیزمە سنتاکسییەکاندا.

١٢. لەداهاتوودا، بابەتی نێو ئەم خاڵە دەکەین بەنووسینێکی سەربەخۆو بلاّوی دەکەینەوە.

١٣. دەرخستنەوەی مۆرفیمەکە بەزەبری بزوێنەکە بۆ چاوی کاڵی ئەو نییە، بەڵکو بۆ ئەو دەنگە کپەیە کە هەڵی دەگرێت. لە ئەوێدا ئەو دەنگە پێویستە بۆ ناوگرایەتی نەک مۆرفیمەکە.

## سەرچاوەکان


١. د. شێرکۆ بابان، میکانیزمە بنەڕەتییەکانی رستەسازی رێزمانی (بوون و هەبون)، هەولێر ١٩٩٧.

٢. د. شێرکۆ بابان، داینامیزمی جێناوی لکاو لە رستەسازیدا، هەولێر ١٩٩٧.

٣. د. شێرکۆ بابان، رێزمانی مۆرفیمی ئێستایی، گۆڤاری رامان ژمارە (٢٠)، ساڵی ١٩٩٧.

٤. نووری عەلی ئەمین، دەوری بزوێنی (ــە) لەزمانی کوردیدا، گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژمارە (١١١)، ساڵی ١٩٨٦.

٥. د. وریا عومەر ئەمین، لە یاسا دەنگییەکانی زمانی کوردی، گۆڤاری رۆشنبیری نوێ ژمارە (١٣٨)، ساڵی ١٩٩٦.

٦. د. وریا عومەر ئەمین، مردنی وشە، گۆڤاری کاروان، ژمارە (٤٥)، ساڵی ١٩٨٦.

٧. رەئوف ئەحمەد ئالانی، کاری هەبوون، گۆڤاری کاروان، ژمارە (٢٩)، ساڵی ١٩٨٥.

٨. د. ئەورەحمانی حاجی مارف، کرداری یاریدەدەر لەزمانی کوردیدا، گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژمارە (١٢٩)، ساڵی ١٩٩٢.

٩. نووری عەلی ئەمین، چاوگی بوون و هەبوون لەزمانی کوردیدا، گۆڤاری کاروان، ژمارە (١٠٩)، ساڵی ١٩٨٦.

١٠. نەسرین فەخری، وەستانێک لە ئاستی هەردوو فەرمانی بوون و هەبوون و (هە) و هی)دا، کۆڕی زانیاری عیراق، دەستەی کورد، ژمارە (٢٣، ٢٤)، ساڵی ١٩٩٢.

# شاعیری ئازادیو گۆمڕاییەکان

## ماڵئاوا... ئۆکتافیوباث

كەمال غەمبار كردویەتی بەكوردی

لەمانگی ئیپریلی ساڵی ۱۹۹۸دا، یەکێ لەگەورەترین رووناکبیرانی ئەمریکای لاتینیو، دیارترین شاعیری سەدەی بیستەم ماڵئاویی لەژیان کرد، ئەویش نووسەری مەکسیکی (ئۆکتافیۆ باث)ی، کەسایەتیی ئەدەبی فرە بەهرەی، ئینسیکلۆپیدیا زالیارییە، کە نێوان مێژووی بیروباوەڕو مێژووی کۆن و نوێ و مێژووی ئەدەبی لێکگرێدا...

یەك لە رووە دیارەكانە لەئەدەب و هزری هاوچەرخی بەئیسپانی نووسراوو وەرگری خەلاتی نۆبلی ئەدەبیاتی ساڵی (۱۹۹۰)ە.

سەرۆكی مەكسیكی (ئەنتسۆ زیدللۆ) ناوی نووسەری كۆچكردووی تەمەنی هەشتاو چوار ساڵە دێنێ و بەمەزنترین رووناكبیرو شاعیری لەقەڵەم دەدا كەمەكسیك لەسەرجەمی مێژووەكەیدا ناسیویەتی.

لەمەدریددا نووسەری بیرۆنی (ماریۆ فارغاس بوسا) لە دوانێكی بۆ ئێزگەی ئیسپانیا (ئۆكتافیو باث)ی بەیەكێ لە رووە گەورەكانی ئەم سەدەیەمانی لەقەڵەم داوە، خۆی شاعیرو توێژەرە، رۆشنبیریی سەردەمەكەی و خۆتێهەڵقورتاندنی گەورەی و رۆشنبیرییەكەی پاڵیان نا كە بەتواناوە بچێتە كۆڕی هونەرو فەلسەفەو سیاسەت.

دوا دەرکەوتنی ئاشکرای ئۆکتافیۆپاث بۆ مانگی دیسێمبەری ١٩٩٧ دەگەڕێتەوە، ئەویش بەبۆنەی ئاهەنگی دامەزراندنی دەزگایەك ناوی ئەوی پێوەیە بەئامادەبوونی سەرۆکی مەکسیکی، مەکسیك ڕێزی لێنا کە یەکێ لەهۆنراوە ناودارەکانی (بەردە خۆر)ی کردە سروودی نیشتمانی ولاتەکە، ئەو ولاتەی کە ڕۆشنبیری ئیسپانی ڕەگی زۆری تێدا کوتاوە بەخێرو شەڕییەوە، جگە لە ئامادەبوونی ڕۆشنبیریی هیندی بۆ ماوەیەك.

ئۆکتافیپۆ باث ڕۆژی ٣١ی مارسی ساڵی ١٩١٤ لەمەکسیکۆ لەدایك بووە، دروستبوونی ڕۆشنبیرییەکەی لەسەر دەستی باثیری رابەری بزاڤی (پشتگیری ئەهالی) و باوکی پارێزەری پاڵپشتی شۆڕشی مەکسیکی و مایەی چاککردنی کشتوکاڵی وەرگرتووە.

هەر زوو ئۆکتافیۆباث دەستی کرد بەچالاکی ئەدەبی، یەکەم شت کەخەریکی کرد، ڕۆشنبیریی مەکسیکی بوو، وەك باثیری بایەخی بەوەدا کەوا گەرد لە کلتووری هیندی مەکسیکی بتەکێنێ و ڕەگی مێژوویی ڕۆشنبیریی خۆماڵی بگەڕێنێتەوە، دەبینین ئەم سەرقاڵییە لەهزرو شیعریدا قووڵە:(بۆم دەرکەوت کەمن لەولاتە یەکگرتووەکان بووم ئەو حەلەی شەڕ منداڵ بووم بۆم دەرکەوت من مەکسیکیم. قسە کردنمان بەئینگلیزی ڕەت دەکردەوەو لەگەڵ منداڵانی تردا بەشەڕ کۆتاییمان دەهات، پاشان گەڕامەوە مەکسیك، هەمان شەڕو گێچەڵم تووش دەبوو و لەبەر هەمان هۆش، تەمەنم چواردە ساڵ بوو نەمدەتوانی لەوە بگەم، بەشێوەیەك ئەزموونێکی تفت و تاڵ بوو کە لەولاتی خۆتدا بیانی بی. دوایی دەستم کرد لەخۆم دەپرسی من کێم؟ بۆ من مەکسیکیم؟ لەدواییدا یەکەم کتێبم لەتەقەلاکانم دەوری هات).



(باث) لەدەرکرنی ژمارەیەك گۆڤار بەشداری کرد، ساڵی ١٩٣١ گۆڤاری ئەدەبی (براندل)ی دامەزراند، ساڵی ١٩٣٢(دەفتەرەکانی دۆڵی مەکسیکۆ) وساڵی ١٩٧٦ گۆڤاری (گەڕانەوە) کە لە بەڕێوەبردنی بەردەوام بوو تا کۆچی

دوایی. هەروەها بەشداری لەزۆر گۆڤار لەدەرەوەو ناوەدا کرد، بەتایبەتی لەجیهانی قسەکردن بەئیسپانی و ئینگلیزی.

هەروەها ژمارەیەك دیوانی شیعرو کتێب و یەك شانۆنامەو وەرگێڕانی زۆری رووناکبیرانی جیهانی بلاو کردەوە، گرنگترین دیوانەکانی (مانگی دەشتەکی ) ١٩٣٣و (نەژادی مرۆڤ) ١٩٣٧و (نێوان بەردو گوڵ) ١٩٤١ و (داڵ یاخود خۆر) ١٩٥١، (ئازادی ژێر پەیڤ) ١٩٥٨، (تسلامنەر) ١٩٦٢، (نشێوێکی رۆژهەلاتی) ١٩٦٩، (گەڕانەوە) ١٩٧٦، (ئاگری هەموو رۆژێ) ١٩٨٨، جگە لەنووسینی پەخشان ئامێزو تیۆرسازی گرنگترینیان :(گومڕایی دابڕان) ١٩٥٠، (کەوان و گیتار) ١٩٥٦، (هەرمێی رەشەدار) ١٩٥٧، (کوڕانی قورە لیتە) ١٩٧٤، (زەمەنێکی بەهەور) ١٩٨٣، (چەند پیاوێ لەزەمانی خۆیدا) ١٩٨٥، (پیتە یەکەمینەکان) ١٩٨٨. سەرجەمی شاکارەکانی خۆی بەر لەمردن لە ١٤ بەرگدا کۆکردەوە، دێڕ دێڕ بێ بێزاربوون و ماندووبوون پێیان داچووبۆوە.

هەروەها ئەو وتارانەی لەگۆڤاری ئەدەبی (گەڕانەوە)دا بلاوی کردبوونەوە کە بەگەرموگوڕی و چالاکی وێرای پیرییەتەکەی خوێندەوە، زۆر شانازی بەم گۆڤارە ئەدەبییەوەو دەکرد، چونکە بەند نەبوو بەخودی وەچەیەك، چونکە نووسەری تەمەن و بۆچوونی جیاجیا تێیان دەنووسی.

(هەوڵمان دا لە رێگەی گۆڤارەکەوە شاکاری نووسەرانی مەکسیکی بلاو نەبۆوە یاخود نەناسراو دەرخەین، بەلام بەشێوەیەکی نەگونجاو، جگە لەوەی یەکەم گۆڤاری ئەدەبییە لەمێژووی مەکسیك، رەنگە لەمێژووی ئەو دەوڵەتانەی بەئیسپانی دەدوێن کە تەنیا پشت بە خوێنەران و بۆ زانینەکانیان دەبەستێ، ئەمە ئامارەکەری لەدایکبوونی چینێك خوێنەری سەربەخۆن لەمەکسیك، دەتوانن گۆڤارێکی ئەدەبی بپارێزن، ئەوەش سەرکەوتنێکی دوو قۆڵی رۆشنبیری و ئازادییە، مەسەلەیەکی گرنگ ناو دەبەم کە دەرچوونی گۆڤارەکەیە لەخەلاتی میر ئەستۆریاس - چاکترین خەلاتی ئیسپانی - لە ساڵی ١٩٩٠دا لەو لقەی تەرخان کرابوو بۆ پەیوەندی و مرۆڤایەتی، بەپێی رۆڵەکەی لەپەیوەندیی فیکری نێوان ئەمریکای لاتین و ئەورووپاو، بینینی دەوری پرد لەنێوان نووسەرانی ئەمریکای لاتینیو ئیسپانیو مەبەست وردبینی و هاندانی فیکرو ئەفراندنی ئەدەبی)

لەساڵی ۱۹۳۷داو لەگەرمەی شەڕی ناوخۆی ئیسپانی (۱۹۳٦ - ۱۹۳۹) لەسەر بانگکردنی پاپلۆ نیرۆدای شاعیر چووە ئیسپانیا بۆ ئامادەبوونی کۆنگرەی نووسەرانی دژ بەفاشییەت.

(ئیسپانیا سەبارەت بەمنەوە ئەزموونێکی فراوانە، لەتەمەنی بیست و سێ ساڵی دابووم، ئەندام نەبووم لەهیچ حزبێك، بەڵکو هاوسۆز بووم لەگەڵ دۆزی کۆمار، زەمانێك بوو باوەڕم بەوە بوو کە شۆڕشەکانی جیهان، لەنێویاندا راپەڕینی مەکسیکی دەسکەوت و تەواوکارییەکانیان لەکۆمۆنیزمدا دەبیننەوە، ئەو رۆژانی گەرموگوڕییە سەبارەت بەمنەوە دەرسی فێرکاری بوون لەبرایەتی بەرانبەر مەرگ، هەروەها بریتی بوو لەدۆزینەوەی رەگی ناوەنجیم، لە (بەرشلۆنە)،(ڤالنسیا)،(مەدرید)دا چەند نووسەرو هونەرمەندو شاعیرم چاوپێ کەوت: میغیل ئیرناتدیس، رفائیل ئەلبیرتی، ئەلتولاغری، لویس پیرانودا کەبووە برادەرێکی گەورە)

لەراستیدا پەیوەندییەکانی لەگەڵ زۆر شاعیرو نووسەرانی ئیسپانی، لەناو ئیسپانیادا توندوتۆڵ بوو، یاخود لەدوورگەدا (مەنفا) دوای هەرەسهێنانی کۆماری ئیسپانی قوت بوونەوەی رژێمی کەتائیبی فرەنکۆیی.

**ئەدەب و سیاسەت**

ئۆکتافیۆپاث چووە کۆڕی سیاسی، لەوەزیفەی دیپلۆماسی کاری کردو، لەنێوان ساڵانی ۱۹٤٦و ۱۹۵۱دا لەپاریس ژیا، کە وجودیەت و ئەدەبی پابەندکاری تیایدا بڵاو ببۆوە، پڕ بوو لە ئیسپانیو ئەرجەنتینی و رۆمانی و یۆنانیو ئەمریکایی باکووری (لەپاریسدا بەئازادی هەناسەم دەدا ئۆرتیغا واتە کاسیتی روناکبیرێکی ئیسپانیم دەخوێندەوە، لەبەر ئەوەی کەمن دەرسی فینۆمینۆلۆجیای دیاردەییم لەسەر دەستی مامۆستایەکی ئیسپانی دوور خراوە دەخوێند - بیروباوەڕەکانی سارتەر زۆر سەریان نەدەسورماندنم، ئەمەش یەکسەر لەوجودییەتی ترازاندم کەلەلای من خێرا وەك مۆدەیەك سەری هەڵدا، لەبەر ئەمە پەیتا پەیتا دەستم کرد بەدامەزراندنی پەیوەندی لەگەڵ فەلسەفەو ئەدەب و سیاسەتدا..

هەروەها لەپاریسدا پەیوەندی لەگەڵ سوریالییەکان کرد، راستەوخۆ لەبەر چەند هۆیەکی ئیستاتیکی هاوسۆزیان بوو (لای سوریالییەکان بەهای رەوشتکاری هەبوو، هەوڵم دا بەشەخسی بیانوێنم، بەهای وا بوون کەجیهانی هاوچەرخی ئێمە چەند پێویستیان پێ هەیە. لەهەمان کاتدا هەستم بەخۆ دەکرد

میراتگری بیروباوەڕە تێکدەرە مژدە بەخشەکانیانم، ئەو بیروباوەڕانەی ئامانجیان گۆڕینی مرۆڤەو گۆڕینی پەیوەندییەکانییەتی لەگەڵ خەڵکی تر، لەگەڵ دەسەڵات و سروشت. یەکەم بەشداریکردن لە ئاووهەوای سوریالی هۆنراوەپەخشانێ بوو بەناوی "دوڕناسی بەردی شووشە").

هەروەها بەبالوێزی وڵاتەکەی لە ژاپۆن و هیندستاندا دامەزرا، کەوا پەیوەندی بەرۆشنبیریی رۆژهەڵاتی کرد، بەتایبەتی دەقە بووزییەکان کە زۆر واقیان ورماند، بەلای ئەوەوە بایەخێکی لەبەخشینی مۆرکی ئیجابی بەسەر سلبی - نێگەتیڤ - دایە. رۆژهەڵات بەلای ئەوەوە دۆزینەوەیەکی جەوهەرییەو کتێبێکی هەیە بەناوی (وەرگەڕانی رۆژهەڵاتی)، ئەدەبی عەرەبی لەماوەیەك لەژیانیدا سەرچاوەیەکی بنچینەیی بوو بۆ سروش و پەیوەندی بەجیهانی عەرەبەوە، کەلەرێگەی لاپەڕەکانی (هەزاور یەك شەوە)دا دەستی پێکرد، هەروەها لەخوێندنەوەکانیدا مێژووی جیهانی ئیسلامی گرنگیەکی تایبەتی بەخۆوە بینی.

لە ساڵی ١٩٨٦دا، دەستی لەپایە دیبلۆماسییەکەی هەڵگرت بەنارەزایی دەربڕینی لەسەر ئەو قەسابخانە چەپەڵەی کە پۆلیس دژی قوتابیان لەوڵاتەکەیدا نایەوە. خۆی تەرخان کرد بۆ گەشت و گوزارو خوێندنەوەو نووسین، شاکارەکانی بەرفرە بوون و کتێبەکانی لە نێوان شیعرو توێژینەوەدا دابەشبوون کە سەر بەمێژووی ئەدەبن. جگە لەنووسینەکانی لەمەڕ سیاسەتەوە.

بەگشتی، شاعیرو رەخنەگرو رووناکبیر بوو، بەرهەمی موتوربەکردنی چەندین ژیارییە. ژیاریی مەکسیکی و ژیارییەکانی ئیسپانە غەزووکەرەکان، ژیارییەکانی ئەورووپیی و رۆژهەڵاتی نوێ. کارەکەی جۆرێك لەتێکەڵکردنی کارامەیی بیروباوەڕو وێنەی ئەم ژیارییە کارلێکانەیە گشتیان.

ئۆکتافیۆ باث چەند خەڵاتێکی ئەدەبی گرنگی جیهانی وەرگرتووە لەوانە: خەڵاتی گەورەی جیهانیی بەلچیکی شیعر ساڵی ١٩٦٣و خەڵاتی ئیسپانی رەخنە ١٩٧٧ و خەڵاتی Ollin Yolitzili مەکسیکی ساڵی ١٩٧٩و خەڵاتی سیرفانیسی ئیسپانی ساڵی ١٩٨١و خەڵاتی ئاشتی نووسەرانی ئەڵمان ساڵی ١٩٨٤و خەڵاتی لاتینی ئەلفۆنسۆریس ساڵی ١٩٨٦و خەڵاتی نۆبل بۆ ئەدەبیات ساڵی ١٩٩٠ و غەیری تر لە خەڵاتی خۆماڵیو جیهانیی تر، ئەویش لەبەر

گرنگی رۆشنبیرییەو بەخشینی وەك شاعیرو نووسەر، هەروەها لەچەندین زانکۆو بڵندگۆی رۆشنبیریی جیهانی دەرسی گوتووتەوە.

## شاعیری شلەژانەكان

(باث) دەڵێ: (سەبارەت بەمنەوە گرنگترین شت ئەوەیە كە سەرچاوەو رەگی چالاكیی ئەدەبیم، من شاعیرم، لەسەرتاكانمدا بیرم نەكردەوە من نووسەر بووم، لەراستیدا شاعیر بووم، لێرەدا سەبارەت بەمنەوە جیاوازە، كەچی من بەرە بەرە زیاتر زیاتر وام لێهات ببم بەنووسەر، من محاوەلات دەنووسم وەك بوارێك بۆ قەرەبوو وەك شێوەیەك لەشیعر).

ژیانی ئەدەبی لەكۆماری (براندال) بەشاعیر دەستی پێكرد، شیعرەكانی تاموبۆیەكی فەلسەفییان هەیە، كە پەیڤەكان لەكۆت و پێوەند دەرباز دەكات: گەڕان بەداوی بوونەوەری تاكوتەرا، غەزووی هەستكردن و گەڕان بەداوی بێ كۆتایی، خۆی قووڵە قووڵایی برین و كەشی خەم و ئازارو ئەشكەنجە وناموێیی و كەشی هیواو شادی.

جارێكیان لەدوانێكیدا گوتی: جاروبار هەست دەكەم وەك بڵێی وشەكان لەبەر شەفافییەتیان بەكاغەزەوە ئاوێزان ناكرێن، لەوە گەردە پەمەییە دەكەن كە لەمێشكماندا لەكاتە لەیەكدوورەكاندا دەدرەوشێنەوە، لەراستیدا چیرۆكی من لەگەڵ وشەكاندا تا بڵێی بە وروژێنەر خۆی دەنوێنێ. هەندێ جار هەست دەكەم كە وشەیەك شێوەی شەخس دەگرێتە خۆی، وەك بڵێی شەخسێك شێوەی پەیڤی وەرگرتووە، بۆ ئەوەی ببی بە نووسەر یا شاعیر دەبێ لەگەڵ ئەم هەموو شلەژانەدا بژی.

(باث) شاعیرێكی داهێنەر بوو، شیعرەكانی خورپەی فیكرن، جاروبار روو دەكاتە هەندێ شێوازی پەخشان ئامێز لەناو پەناوپێچی هۆنراوەكانی، هەر وەك پیشەی لەچەندین هۆنراوەی پەخشان ئامێز كەپشت بە ترپەی ئازاد دەبەستێ و پابەندی كێش نابێ، بەڵام ئەم نووسینانە نرخی هونەركاریی شیعری لەدەست نادەن، بەكارێكی داهێنەرانە دەمێننەوە، شیعر لای ئەو فێربوونی بەردەوامە، دایەلۆگە لەگەڵ لاساییكردنەوە، بەڵام لەهەمان كاتدا دوژمندایەتییە لەگەڵی، دایەلۆگ لەگەڵ دەنگی شەقام، دەنگی شار دەنگی كۆڕ، دایەلۆگ لەگەڵ دەنگەكانی تردا، ئا ئەمەیە ئەركی راستەقینەی شیعر، ئەركی پێدانی مافی ئاخاوتن و

خۆشەویستی ژیان بۆ مەرگی ناشەخسی، دەنگی شیعر دەنگی هی ترە.

کارلۆس فوینتۆسی رۆمانووس لەو رایە دایە:(کورتیار (١٩١٤ - ١٩٨٤)و ئۆکتافیۆپاث (١٩١٤-١٩٩٨) سەر دەفتەری ئەو وەچەن کە مانای بەهاو چەرخی ئێمە بەخشیو، رێگەی بەپێداچوونەوەی گەورەترین هەڵەشەی نوێ کرد،لەو کاتەی هەموو شتێ تێیدا سەری هەڵدەدا وەك بڵێی دەلالەتی لەوە دەکرد که هیچ نوێیکی بکرێ لە ئارادا نییە، چونکه کۆتایی پێشکەوتنە. بەلام لەسەر ئاستی ئیستاتیکیدا هەردووکیان دوو کەسی زۆر چاو تیژترن لەسەرەوەی ئەم وەچە ئەمریکییەی لاتینی، ئەوان بوون کە توانیان پەردە لەسەر شتێکی تری دوا زانیاریی ئەو سروشتەی کە سەبارەت بەجەستەوە، بەساتی بیرو (ژاکرە)و خەیاڵەوە لەباتی داناندرێ. ئەو بەشدارییەی رێگەی بەوەچەی ئێمەدا کە بینای فیعلی نیسبەتەن بۆ فیعلەکان دابمەزرێنی، کەوا لاساییکردنەوە دەست بۆ نوێکردنەوە درێژ دەکات).

(باث) پەی بەبەهای خەباتگێری وشەی شەرفمەند بردو بڕوای بەوو کارێگەرییەکەی هێنا، هەرگیز بۆ شتێك خەڵك و هەندێ کیلۆمەتر دووجای نەنووسیوە. وەزیری رۆشنبیری پێشووی ئیسپانیا کەخەڵاتی سیرفانتسی وەرگرت وای وەسف کرد کە دلکۆکی لێکەری گیانفیدایە لە ئازادییەکان و شاکارەکانی گشتیان سروودی ئازادی دەنوێنن، بێ رەچاو کردن ئەگەر بۆ ساتێکیش بێت بۆ هەر ئیعتباراتێکی ئایدیۆلۆژی سیاسی، جارێکیان لەدوانێکیدا گوتی: وشەی هارانەتر بەکار دێنێ، ئەو پەیڤانەی زۆر خۆش دەوێ کە لەبروسك دەچن، چونکە شەو تێك دەشکێنن لەساتێکا، بەلام روونـاکی دەتەقێننەوە، شەویش لەئەمریکای لاتینی سەرتاپای زەمەنە.. زەمەن جلی پۆلیس لەبەردەکات و تەنانەت تا گۆڕیش راوت دەنێ.

(گەلێکی بێ شیعر، گەلێکی بێ گیانەو، نەتەوەیەکی بێ رەخنە گەلێکی کوێرە، شیعر لەتیشکی خۆر دەکات لەئەمریکای لاتینی).

بڕوای بەچەند گوزارەیەك هێناو کاریکرد بۆ بلاو کردنەوەیان لەناو ولاتداو لەدەرەوەیدا، رۆژێك پرسیاری لێکرا لەوەی شیعر ئەمرۆ دەتوانێ لەناو کۆمەڵدا، وەك کۆمەڵی مەکسیکی بیکات، لەوەلامدا گوتی:(لاساییکردنەوەی شیعر لەمەکسیك زۆر کۆنە، بەر لەوەی ئیسپانەکان بگەنە مەکسیك

مومارەسەکردنی دەستی پێکردووە، هەروەها ولاتەکەمان ژیاری رەسەنی مەزنی ناسیوە، شیعر لەم ژیارییانەدا شوێنێکی مەڵبەندیی کۆنترۆلکراوی داگیر کردووە، خۆی رەوشتێکە لەچەرخی جاهیلی لە ژیاریی عەرەبیدا، کەشیعر بەشەڕو خۆشەویستییەوە لکابوو، لەسەردەمی مەکسیکییە کۆنەکان یان ئەوەی بە هیندە مەکسیکییەکان ناسراوە، شەڕ



پێگەیەکی مەڵبەندی لەژیاریی رۆشنبیری و کۆمەلایەتییەکەیاندا داگیر دەکات و، سروشتیشە کە شیعر یەکێك بوو لەهۆکارەکانی دەربڕین لەم شەڕەدا، لەچمکی ئەم شەڕە کە پەیوەندییەکی توندوتۆڵی بەچمکی ئەو گەردوونە هەیە کە لەگەڵ خۆیدا لە ململانێیەکی بەردەوام دایە، شاعیرەکانیش لەمەکسیك ئەرکێکی رەخنەسازی رادەپەڕێنن و ئەو تێڕوانینە رەوشەنە پێك دێنن کە لە رێگەیەوە کۆمەڵ خۆی تاقی دەکاتەوە.

زۆری خوێندەوە، لەزۆر ناوچەکانی جیهان جا ئەوانەی بەئیسپانی یاخود ئینگلیزی دەدوێن دەنگی خۆی پێ گەیاندن و شاکارەکانی وەرگێڕدرانە سەر زمانی زۆر، لەوانە زمانی عەرەبیو لەزۆر کۆڕی ئەدەبیو رێکخراویی نێودەوڵەتی ستایشیان کرد.

هەردەم لەو باوەڕەدابوو کە هەن دانیان پیانا کە ئەوان بێ خەمتر بوون کە شاکارەکانیان خوێندەوە. برادەرە مەکسیکییەکەی خوان رۆلفۆ جارێك بەوە وەسفی کرد کە گەورەترین شاعیرو نووسەرە زۆر کار دەکات و تاخوا بڵێ بەسە نووسیو، لەتەك بیدرۆ سالیناس و شاعیر ئیسپانی لەوەچەی (١٩٢٧) بەچاکترین شاعیر لەقەڵەم دەدرێ. بەلام کارلۆس بارل بەو شاعیرەی لەقەڵەمدا کە گوێ بیستبوو، تێگەیشت و گۆرانی چڕی ماوەی پەنجا ساڵ بە رەسەنی.

بەراستی (باث) شێوازی گۆرانی ئامێزی قەشەنگی لاتینی بوو، هەروەها قوولایی لەسەرخۆی، راماو بوو کە خۆیو تەمەنەکەی بۆ کارێکی خۆشەویستانەی هەمەرەنگی بێ هاوتا تەرخان کرد. تەنانەت کاری دیبلۆماسیش کە زۆری خەریك کرد تەنیا بیانوویێك بوو بۆ ژیان لەگەڵ بێ گەردیو هەڵقولانی ئەدەبی کەهەتا دوا ساتەکانی تەمەنی لێی جیا نەبوونەوە.

چەند نموونەیەك لەشیعرەکانی:

## دۆستایەتی

ئەوە ساتی چاوەڕوانکراوە
لە ژوور مێزەکەوە بێ وچان
قژی پەرش و بڵاوی مۆم
دەکەوێت
شەو پەنجەرەکە بێ سنوور
گەورە دەکات
کەس لێرەدا نییە، ئەو ئامادەبووەی
بێ ناوە
دەمپێچێتەوە.

## گردی بەرخ

لێرەدا پێشینان پێشوازییان نە ئاگر دەکرد
لێرەدا ئاگر دونیای داهێنا
لەدەمی نیوەڕۆدا دارودرەخت وەك میوە
دەپشکوون
ئاو پێڵوەکانی دەکاتەوە
رووناکی بەپێستی ڕۆژدا دەرژێ
خاڵێکی هێجگار گەورە کات لەنێویا پێچەوانە
دەبێتەوەوە کپ دەبێ

## برایەتی

من مرۆڤم: ژیانم کورتە
شەو جاویدانە
بڕوانە سەرەوە
ئەستێرەکان دەنووسن
تێدەگەم بەڵام نازانم
هەروەسا منیش نووسین
لەخودی منیش نووسین
لەخودی ئەم ساتەدا
هەیە حینجەیی من دەکات(*)

---

(*)ئەم نووسینە لەگۆڤاری (مجلة العربي) ژمارە (١٧٨)وەرگیراوە، کە محمد القاضي ئامادەی کردووە.



# چەند سروودێکی نیتشەو دانتێ

وەرگێڕانی: کەریم دەشتی

## 1
## سرودی شەو

**نیتشە**

شەو راشکاو خوڕەی هەڵچووی ئاوەکان بەرز بۆوە ، دەرونیشم سەرچاوەی هەڵتۆقیوی خۆی هەیە ، شەو راشکا لەدەمی هەموو عاشقاندا سرود بەرز بۆوە ، ڕۆحم چییە ، جگە لەوەی سرودێک کە لەو سرودانە نەبێ ، هێزێکی شۆڕشگێڕ لەناخەوەمدا دەیەوێت دەنگی خۆی رەها کات ، کە شەوقێکە بۆ نەڤین و بەیانەکەی بەیانی عاشقانە ، من رۆشناییم خۆزگە تاریکی دەبووم ، هەلا لەبەر ئەوە کە بەگۆشەگیریو تەنهایی بەسەرما زاڵ بوون چونکە بەرووناهی گرم تێبەربووە ، ئەگەر تاریکی بوام ، ئەوە دەکرا بەرەکەتی خۆمتان بۆ بنێرم ئەی ئەستێرە درەوشاوەکانی دەنکە چکۆلەکان ئاسا لەئاسماندا ، چێژم لەو تیشکانە وەرگرتبا کە ئێوە بەمنتان دەبەخشی ، بەلاّم من بە روناهی خۆم دەژیم ، ئەو نێلە ئاگرە دەخۆمەوە کە لەخودی خۆمدا هەڵدەچێ و حەرامی چێژی ئەوانی دیکەم کردوە ، زۆر جاران وام بۆ هاتووە کە لەززەتێک لەدزین هەیە لەوەرگتنا نییە ، دەستەکانم لەهەوڵدان ناکەون ئەوەش هەژاریمە ، من هەمیشە سەیری ئەو چاوانە دەکەم کە تەژی چاوەڕوانین و سەیری ئەو شەوانە دەکەم کە شەوق دەیانخاتە گروگلّپە ، ئەوەش ئەو پیێ هەڵکارییەیە کە بێزارم دەکات ، ئای بۆ شەقاوەتی بەخشندەکان ، وای بۆ تاریکی هەتاوم ، وای بۆ شەوقی خۆم بۆ تاسوق ، وای لەتوندی ئەو برسیەتییە لە ( . . . . . ) ؟ ئەوان ئەوشتانە وەدەگرن کە پێیان دەبەخشم بەلاّم هەمیشە لە رۆحیان بەدوور دەمێنمەوە ، لەمیانی هەوڵدەرو وەرگردا چاڵێکی قووڵ هەیە ، لەوانەیە نزیکترین ژێر چاڵ پڕ کردنەوەی لەهەمووان زەحمەتتر بێ ، جۆرێک لەبرسیەتی لەهەناوم دا

دێتە کایەوە وام لێدەکات لۆمەی ئەوانە بکەم کە روناهی خۆمیان بۆ دەنێرم، شەیدای ئەوە دەبم کە دەست بەسەر ئەوانە دابگرم کە شتی خۆم پێ بەخشیون.

ئا بەمجۆرە تینوی ئەوە دەبم کە ئازار بگەیەنم و دەستەکانم بکێشمەوە لە دوای ئەوەی کەدرێژم کردبوون، دەنگ دەدەمەوە وەک دەنگدانەوەی تاقگە لەهەڵرژانی دا بەرەوریژگەی خۆمدا .

ئەم جۆرە تۆڵەیە لەگەڵ مەزنیم دایە، ئەمجۆرە مەکرەش لەگۆشەگیریمدا دروست دەبێ، بەختەوەریم لەبەخشینیدا ون کردووە، لەبەر ئەوەی ئەوەندەم بەخشیوە چاکیمی لەخودی خۆی و لەبوونی خۆیدا کوشتووە، ئەوەی کەبەردەوام بێ لەبەخشین، بە لەدەست چوونی ژیان، هەرەشە لێ کراوە، دەبێ هەر حەسانەوەی لەسەلیب بدرێ و وشک کاو دڵیشی رەق هەڵگەرێ.

ئیدی ئەو گلێنە چاوەم نەماوە فرمێسک بۆ شەرمی ڕەحم بەخشەکان هەڵرێژێ ها ئەوە دەستەکانم دژوار بووە هەتا لێی قەدەغەکراوە کەهەست بەلەرزینی ئەو دەستانە بکات کە لێوان لێو دەبن، فرمێسکی چاوەکانم کوان؟ و نەرم و نیانی دڵم کوا؟ وای بۆ تەنیایی هەموو بەخشندەکان وای بۆ بێدەنگی هەموو سووتاوەکان بەرم..... چەندین خۆرەتاو کە لەژمارە نایەن دەسورێنەوە لە نێو زورگی هەوادا کە بەتیشکەکانیان قسە لە وەدەرخەرەکانی تاریکی دەکەن، منم تەنها کە مەحرومم لەقسەوباسی ئەو خۆرەتاوو بەیانکردنی ئەو خۆرە تاوانە.

وای چ پەیوەندییێکە کە ئەو روناهییە بەو ئەستێرە روناک بەخشانە پەیوەست دەدات لەخۆیدا، ئەو روناهیانە بەسەریانا رەت دەبێ ئەوانیش بەناوردانەوەییێکی وشک مۆرەی لێدەکەن و لەپێناویا دەرۆن، ئا بەمجۆرە هەموو هەتاوەکانیش لەهەوایاندا دەرواو نەفرەت لەهەموو جورمێکی رووناک بەخش و سارد دەکات کە خوشکانی خۆی بەگەرماتی خۆیان ناحەسێنێ.

خۆرەتاوەکان هەروەک رەشەباکان لەبورجەکانی خۆیاندا هەڵدەچن بەدوای ئەو هەنگاوانەدا دەچن کە بە ئیرادەی بەهێزی خۆیان داینناوە نهێنی گەرمی و ساردیشیان لەوەدایە.

ئەی ئەستێرە سووتاوەکان بەتاریکی شەو، کەسێکی دی گەرماتییێک لەدرەوشانەوە خەڵق دەکات؟ تۆ بەتەنها لەژێر بالابەندەی هێزدا شیری مەکی روناهی دەخۆیت.

وای... شەختە هەڵم دەسورێنێ و دەستەکانیشم بە بەستەڵەک دەسووتێ، من بەگڕێ داگیرساوم کە بەتینویەتی ئێوە نەبێ ناکوژێتەوە ئەوە تاریکی دونیای داگرت.. ئەدی بۆچی وا لەسەر من کراوە کە روناهییێکی تەنهاو تینووبم بۆ تاریکی..؟

ئەوە تاریکی دونیای داگرت و شەوقم وەک جۆگەلەکانی داڕژاو دەیەوێت هاوارو سەدای ئەو شتانە بکات کە لەخۆیدایە، شەو راشکاو خورەی ئاوەکان داڕژاو دەرونیشم کانی خۆی هەیە دەتەقێ..

## 2
## سرودی سەما

زارا بەدارستان داچوو و هاوەڵەکانیشی لەگەڵدا بوو ، کەبەدوای سەرچاوەدا دەگەڕا ، مێرگێکی دۆزیەوە لەمیانی دارودرەخت و دەغڵەکانا راخرابوو ، رەوە جوانکیلەیێ دوور لەچاوی چاودێران سەمایان دەکرد ، کەدیتیان ئەوە کێیە دێت ناسیان ولەسەماکردنا وەستان بەلاّم زارا لێیان وەنزیک کەوتەوە پێی گوتن:

ـ بەردەوام بن لەسەمای خۆتان ، ئەی کچەجوانەکان ، ئەوەی کەهاتووە قەت بەدڵخۆشان وەرس نابێ و دوژمنی جوانکیلان نییە ، من ئەوەم کە داکۆکی لەخوا دەکەم لەبەرابەر ئەهریەمەن ، ئەهریەمەنیش چییە تەنیا رۆحێکی قورسە ، ئایا پێم دەکرێ ببمە دوژمنی ئەو جیلوەو لەش سوکی و رۆح سوکیەی کە لەئێوە دایە ؟

گومانی تێدا نییە کەمن دارستانێکم رەشە درەختەکانی تێدا تێکچرژاون و تاریکی کەوتۆتە هەموو لایەکیانەوە ، بەلاّم ئەوەی کەبەبێ ترس خۆی لەتاریکیم دەدا ، لەژێر سەروە ترسناکەکانی مندا چەند رێگایەک دەدۆزێتەوە کە ئەملاو ئەولای گوڵە ، هەروا ئەو خوا بچکۆڵەیە دەدۆزێتەوە وەک جوانکیلان بەتاسووقەوەن بۆیو بەکپی لەنزیک کانیاوەکاندا چاوی خۆی داخستووە.

لەکاتی نیوەڕۆدا خەوت ، ئەو خوایە پاڵ کەوتووە ، رەنگە بۆ ماوەیێکی دوورودرێژ هەوڵی دابێ تا ژمارەیێکی زۆر لەو پەپولانە راو بکات. .

ئەی سەماکەرە جوانەکان وەرستان نەکات رەنگە هاوار دەکا ، دەگری بەلاّم خۆشیتان بۆ دەهێنێ لەگریانی خۆیدا نیدی بۆ ئێوەی رادەدەم و دەهێنم ، فرمێسکی بەسەرگۆناکانیدا هەڵدەرژێ تا داواتان لێ بکات کە سەمای لەگەڵدا بکەن ، جا ئەگەر سەمای کرد ئەوە من بەسرودی خۆم لەگەڵیدا دەبم ،نەغمەکانیشم نایەن تەنها بۆ ئەوە نەبێ کە زللەیەک لەو رۆحە گرانە بدەن. . رۆحی ئەهریەمنی بەرزەوە بوو کە بەخەڵک دەڵێ دونیا دادەگرم.

ئا ئەوە ئەو گۆرانیە بوو کە زارا بەهۆیەوە دەنگی هەڵبڕی ، لەکاتێکدا ـ کوپید ـ خوای ئەڤین لەگەڵ جوانکیلەکاندا سەمای دەکرد

(رۆژێ لە رۆژان چاوم بڕیووەتە چاوی تۆ. . ئەی ژیان ، وات حسێب کرد کەمن کەوتمە چاڵێکی زۆر قووڵ بەلاّم تۆ بەجحێڵی خۆت لە ژێرەوە منت راکێشاوە ، قاقایەکی بێزەوەنت سەردا کاتێ کە گوتم غەدری تۆ قەراری نییە ، وەلاّمت دامەوە: ئەوە هەموو ماسیەکان وا دەڵێن کاتێ تواناى ئەوەیان نابێ قوولاّییەکان ببڕن و وای حسێب دەکەن کە قەراریان نییە

(.....) جا ئایا من ئەو خوایەم کە نەفرەتم زوو زوو دەگۆڕێ؟ ئایا من تەنها ژنم؟ ژنێ کە چاکەی نییە؟ خەڵک زۆر باس لەسیفاتی من دەکەن، بەلام هەموویان دەڵێن من کۆتاییم نییە، پڕم لەنهێنی.

خەڵکینە.. ئێوە چاکەی‌خۆتان لەمن دەبینن، ئێوە ئاگاو پەیوەندیتان بەوە نییە کەدرک بەشتێکی دیکەوە بکەن.. نەی باشەکان.

تا ئەو ژیانە بوو کە بۆ ئەو سوخریەتەی کەوتبووە قاقا.. بەلام من متمانەم پێی نییە باوەڕ بەپێکەنینشی ناکەم کە جوێن بەخۆی دەدا.

ڕۆژێکیان هانام بردە بەر حیکمەتی هەڵچوونی خۆم.. بەتوڕەییەوە پێی گوتم: تۆ داوای ژیان دەکەیت و خۆشت دەوێ و بەتاسوقەوەی بۆی، کە ئەوەش هانت دەدا هەوڵی ستایشی بۆ بدەی، جا ئەگەر من دانم بەخۆما نەگرتبا ئەوە بەتوندوتیژی ڕەددی حیکمەتی خۆم دەدایەوەو حەقیقەتم پێ ڕادەگەیاندو ئەویش توڕەی دەکردم، ئایا وەلامێک هەیە کاریگەرتربێ لەحیکمەت کە سەریرەی هەتک بکرێت؟

جگە لە ژیان شتێکی دیکەم لەدڵەوە خۆش نەویستووە، خۆشەویستیشم بۆی ناگاتە ترۆپک تەنها ئەوکاتەی کە بێزی لێ دکەمەوە، جا ئەگەر بۆ حیکمەت پەلکێشی بکەم و غەرق بووم لەپەنا بردن بۆ تۆ ئەوە تەنها بۆ ئەوەیە چونکە موبالەغە دەکات لەیادم بۆ ژیان.

حیکمەت دوو چاوی ژیانی هەیەو بزەکانی ژیانی هەیە هەروەها شەبکەی زێڕینی ژیانی هەیە.. ئەدی من چارم چییەکە تا ئەو ڕادەیە بەو دەچم؟

کەژیان لەبارەی حیکمەتەوە لێی پرسیم وەلامم دایەوە:

حیکمەت ئەوەیە کەمرۆڤ بەهەموو هێزێکیەوە حەزی دەچێتێ و لێی تێر نابێ، سەیری دەکا تا دەم و چاوی ئەوی لەپشت دەمامکەوە، بۆیە دیاردەکەوێت پەنجەکانی خۆی لەمیانی تۆڕە کراوەکانیدا بۆ درێژ دەکات و لەجوانی ئەوا دەپرسێ و ناشزانی ئەو جوانییە چییە؟ بەلام لەگەڵ ئەوەشدا کۆنترین ماسی ناتوانێ خۆی ڕزگار کات لە پەلکێش بوونی بۆ ئەو پاروەی تۆڕەوانەکەی ڕارایەو زۆر زیرەکە، ئای چەندم دیتووە کە لێوی خۆی دەگەزێ و قژی تەسریحە دەکات.. لەوانەیە خراپ و فێڵباز بێ، بەڵکو لەوانەشە هەموو سیفاتێکی ئافرەتی تێدا بێ و ناگاتە دوورترین مەدای خۆی لە ڕاکێشانی دلان تەنها ئەو کاتە نەبێ کەهەجوی خۆی دەکات.

دوای ئەوەی ئەوەم دەربارەی حیکمەت گوت بۆ ژیان.. بزەییکی خراپ و فێڵبازانەی کەوتە سەر لێوو پێڵووەکانی داپروکاندو گوتی: دەربارەی چی قسە دەکەی؟ دەڵێی دەربارەی من قسە دەکەی؟ ئایا بۆ مرۆڤ هاتووە ئەم جۆرە قسانە بکات؟ لەرووی ئەوەی کە پێویستی پێیەتی هەتا ئەگەر لەسەر هەقیش بێ؟ ئێستا قسەت چییە لەبارەی حیکمەتەوە ئەی تۆ؟

ژیانی خۆشەویست چاوەکانی کردەوەو وای حسێب کرد کە گەڕامەوەو رمان بۆ قولاییە بێ بنەکان.

ئەوەبوو زارا گۆرانی پێ دەگوت کە سەماکە کۆتایی هات و جوانکیلەکان لەبەرچاویدا ئاوابوون تووشی خەمبارییێکی قووڵ بوو؛ هەتا ون بوو و مێرگەکە رتوبەتیان هەڵگرت.. ئیدی دارستان دەستی کرد بەهەڵکردنی ساردی خۆی، شتێکی نادیار بەدەورم دا دەسوڕێ و لێم مۆن بۆتەوەو دەڵێت: ئایا هێشتا لە ژیاندا ماوی زارا؟ جا بۆچی هێشتاکە تۆ زیندووی؟ بایەخی ئەم ژیانە چییە؟ سەرچاوەت چییەو چارەنووست بۆ کوێیە؟ ئایا شێتایەتی نییە تۆ لەژیاندا بمێنی؟

وای هاوڕێکانم.. ئەوەی کە لەمندا هانا دەبات کاکلەی تاریکییە لەخەمەکانم ببورن ئێوارە داهات.. لێم ببورن لەهاتنی ئێوارە، بەڵێ زارا ئا بەم جۆرە قسەی کرد.

## چەند پەرەگرافێک لەدۆزەخ و بەهەشتی دانتی

### (1)

**لەسەر دەروازەی دۆزەخدا وا نووسراوە:**

مرۆڤێ لەدەروونی مندا هەنگاو دەنێ بۆ ناو شاری خەمەنگێزی من

مرۆڤێ لەدەروونی مندا پێ دەنێتە سەر رەنج و ئازاری ئەبەدی

مرۆڤێ لەدەروونی مندا رەزیلێکەلەجۆری گوم بوو دێتە ریز

داد خواهی پەروەردگاری بڵند پایە منی هێناوەتە جونبوش

هێزێکی خودایی منی ئەفراند

ئاوازێکی رەها یەکەمین عیشقی منی هێنا وجود

بەر لەمن هیچ ئەفرێندراوێ نەبووە

مەگەر بوونەوەرە جاویدانیەکان و بوونی من جاویدانییە؟

ئەی ئەو کەسەی هەنگاو دەنێیتە بەر ئەم دەرگایە

هەر ئومێدێکت هەیە رەهای کە.

(2)

لەدۆزەخدا رۆحێکی بێ جەستەی فرانچسکا بەمجۆرە بۆ دانتی دێتە گۆ:
کاتێ کەخودان بەختێکی رەش دێت... غەمێکی گەورەتر
لەوە نییە رۆژانێ شادی بهێنم...رۆژێکیان
بەهەر دڵخۆشییێکی خۆم بوو داستانی (لان سلوت)م دەچڕی
کە چۆن بووە بەندەی زێڕ کری عەشق، هەردووکمان تەنها بووین
هیچ بەدگومانێک نزیکی ئێمە نەبوو.. زۆر جار لەکاتی چڕیندا
چاوەکانمان یەکتریان خۆش ویست.. رەنگە لەگۆنای گۆڕاوی ئێمەدا نەما
بەڵام لەیەک ساتدا
تەنها هەردووکمان کەوتین
چونکە داستانی ئەو بزەیەمان دەچڕی
ئەو بزە داوا کراوەی کەپێیەوە ئەو دڵدانەوەی کەوەژد
لێوی بەسەر لێوی دولبەرەوە دانابوو..
ئەوێک کەقەد لەمن جودا نەبوو بۆوە
بەبێ درەنگی.. سەرتاپا بەلەرزینەوە لێوەکانی ماچ کردم
کتێب و نەقاش هەردووکیان دەلالی عەشق بوون ئەو رۆژە
ئیدی هیچ لاپەڕەیەکی کتێبێکی دیکەمان نەخوێندۆتەوە.

(3)

**ڤیرجیل بەمجۆرە قسەی بۆ دانتی کرد:**

با پێی دیدگای من لەوە بەرزتر نەچێ، من بەوەستایی و هونەرەوە، تۆم هەتا ئێرە هێناوە، ئێستا لەززەتی خودو رێشاندەری خۆت
بسازە، سەیری خۆرەتاوکە، کەتیشکەکانی لەتەوێڵت دەدا،
سەیری گیاکان کە سەیری درەخت و گوڵەکان بکە، کە ئەو
سەر زەمینە بەفراوانی خۆیان سەر هەڵدەدەن..

تا ئەوەی کە چاوانی درەخشانی (بیاتریس)
بەخۆشحاڵی بێن و.. چونکە وەک چۆن گریان بوو منی بەپەلە بۆ
یاری کردنی تۆ مەجبور کرد
ئێستا ئەگەر دەتەوێ ئارام بگرە
یا هەر شوێنێ مەیلی تۆ بێ بەنازەوە
ئیدی لەمەز یاتر مەترسی زمانەوانی یا هێمایێکت لەمن نەبێ
ئازادانە لەفەتوای خۆتدا.. لەهەڵبژاردن ئاگادار بە.. ئاقڵ..
کەواتە من تاجی خوسرەو وکڵاوی قەشەت پێ دەبەخشم
تا فەرمانڕەوای خودی خۆت بی.

(4)

**دانتی لەفەلەکی هەشتەم سەیری خوارەوە دەکات و زەمین بەشێوەیێکی زۆر قێزەوەن دەبینێ و لەبیست و سێیەمی بەهەشتدا بەمجۆرە دەدوێ:**

هەتا وەک مەلێک لەنێوان سایەبانی خوریدا
بەدرێژایی شەوی تاریک لەهێلانەی خۆی، بەسەر بێچوە ئازیزەکانی خۆی هەڵکورمابێ
بێ قەرار لەشەوقی دیتنی رووی داواکراوی ئەوان بێ
بەتاڵ لە ئەندێشەی ئازاری خۆی، خۆراکی ئەوانی بردە هێلانە
ئەو (بیاتریس) لەپێ نیگای خۆی بەسەر هەڵبژاردنی عەترەکە
لەسەر تەختی ئەوانەوە شوێنی هەیە، بە رامان و بە خەیاڵەوە لەچاوەڕوانی
خۆرەتاوە، نەک بۆ تا هەتا.. تا ئەو کاتەی کە
سەحەر ئەزەری تاسوقی خۆی لەرۆژهەڵات وەرسوڕێنێ.

**سەرچاوە:**

- **هکذا تکلم زرادشت. فردریك نیتشە / و. فیلکس فارس**
- **دائرە المعارف ادبی/ لەفارسییەوە کراوەتە کوردی**

# هایدگەری شەرخواز... هایدگەری خێر لە بیلۆگرافیایەکی تازەی زرافدا

نووسینی:نامق کامل
و: چنور نامق حەسەن

(بلیمەت و درندە) دوو رۆمانی سەرەکیو تایبەتن بەفەیلەسوفی ئەڵمانی و وجودی مارتین هایدگەرەوە، لەبارەی رۆمانی یەکەمەوە هیچ گومانی تێدا نییە کە هایدگەر بەکەسایەتییەکی مەرکەزی دادەنرێ لەبیری وجودیداو یەکێکیشە لەفەیلەسوفە بیر قوڵەکانی سەدەی بیستەم.

ئەدمۆند هورساڵ کە یەکێکە لەپێشەوایانی فەیلەسوفەکانی سەرەتای ئەم سەدەیەو جێگایەکی تایبەتی بۆ دادەنرێ بەتایبەتی لەدوایین ساڵەکانی جەنگی جیهانی یەکەم پێی وا بوو هایدگەر دەبێ بەمیراتگری ئەو.

لەبیستەکاندا هیدگەر بەباوکی رۆحی دادەنرا بۆ زۆربەی فەیلەسوفەکانی ئەوو ئەوەی پاش خۆی هات وەکو مارکۆزو کادمر و هورکهایمر، بەڵام گەورەترین کارتێکردنی بەشێوەیەکی تایبەتی لەسەر ژیانی رۆشنبیری بوو لەفەرەنسا. هەروەها کتێبە دەگمەنەکەی (بوون و زەمەن) کارێکی گەورەی کردە جان پۆل سارتەر، بیرو بۆچوونی لەبارەی بوونەوە بوو بەسەرتای دەسپێکی سەرجەم بزوتنەوەی وجود هەروەها ئەم کتێبە بەهاترین چاپکراوە فەلسەفیەکانیەتی کەلەساڵی ١٩٢٧دا بڵاو کرایەوە، لەهەمان ساڵیشدا کتێبەکەی هیتلەر (کفاحی) بەدەرکەوت ئەمەش بۆخۆی نیشانەو مەغزای خۆی هەیە لەگەڵ ئەوەی کە فەلسەفەی هایدگەر فەلسەفەیەکی تجریدی ئاشکرایە بەتوێکل و بەزمانێکی درشت

نووسراوەتەوە تەفسیرو شیکردنەوەی ئاسان نییە وەکو کتێبی (کفاحی) هیتلەر، ئەو بۆچونەش هەیە کە هایدگەر بە (وەحش) دەژمێردرێ،ئەویش بەبۆنەی پشتگیری کردنی لەنازیەکان و بەچالاکی لەسییەکاندا، بەشێوەیەکی تایبەتی ئەوە شتێکی زانراوە کە هایدگەر لایەنگری نازییەکان بووە هەر لەسەرتای دروست بوونییەوە لەسییەکاندا. بەشێوەیەکی راستگۆیانە ئەم رایەی خۆی ئاشکرا کرد هەروەها لایەنگرێتی خۆی بۆ سیاسەتی هیتلەر دەربڕی، بەڵام لەلایەکی ترەوە بەمانای سیاسی خۆی ئەندامی نازییەکان نەبووە، بەڵکو بەبۆچوونی ئەو فەلسەفەکەی دەبێتە هاوسەنگی رۆحی بۆ سەرکردایەتی هیتلەر لەساڵی ١٩٣٣ کرا بەسەرۆکی زانکۆی فرانبورغ ئەوەش یەك لەخواستەکانی هیتلەر بوو بۆ یارمەتیدانی لەدانانی بۆچوونە رامیاریو کۆمەڵایەتییەکانی جێ بەجێ بکات. پاشان بوو بەیەکێ لەداواکارە سەرەکییە بەرەواجەکانی فیکری نازییەوە لەناو ئەڵمانییەکان، قوتابیانی هان دەدا بۆ بەشداری کردن لەمەشقی سەربازی وەکو ئەوەی کە سەرۆك بێت، وا بەدەر دەکەوێ ئەم رەفتارە دیاردەیەك بێ بۆ میتۆلۆجیای خود کە بەلایدا دەچوو، یەکێ لەقوتابییەکانی هیدگەر توانجی لەسەر ئەوەدا کەوا پێوە بووە لەگەڵ نازییەکاندا لەبەشێکیدا دەگەڕێتەوە بۆ بلیمەتیەکی هەڵخەڵەتێنەر لەبەشێکی تریشدا بۆ حاڵەتێك لەحاڵەتەکانی نائومێدی کە بەرەو ملهوڕی دەڕوا، شتێکی ئاسایی بوو کە بۆچوونە سیاسییەکانی هایدگەر بەزۆری کاربکاتە سەر پەیوەندییە کەسایەتیو رۆشنبیرییەکانی بەناوی رایخەوە سەرنجی گستابۆی بۆ لای مامۆستاکان رادەکێشا کە ئەڵمانی نین لە زانکۆدا، ئەوەش بەپیس کردنی ناویان کە بەناوی کەسانێکی باوەڕ پێ نەکراون لەبواری سیاسەتدا، بەڵام کە هایدگەر هاتەوە سەرخۆ بۆ ئەم هەڵچونەی درکی بەوە کرد کە دەبێ رەتی بکات. بەم شێوەیە لەدوای نۆ مانگ حیزبی نازی بەجێ هێشت پاشان بەزوویی دەستی کێشایەوە لەسەرۆکایەتی زانکۆ لەساڵی ١٩٣٤ لەکاتێکدا شەڕ لەگەرمەیدابوو، فەلسەفەکەی هایدگەر زۆر بەرەو گۆشەگیری دەچوو لەبایەخ دانی بەماوەی پێش سوکرات لەوکاتەی ئەڵمانیا لەگەرمەی جەنگدابوو ئەو رایەی لێ دەگێڕنەوە زۆرینەی کارتێکەرانی فیکری هایدگەر لەدوای شەڕ لە جولەکەکان بووە وەکو حنا ارندت، باول

سیلان لەلایەنە چەپڕەوەکانیش وەکو سارتەرو مارکوز، یان لەسەرکردە بەرهەڵستکارەکان وەکو شاعیر ڕێنیەشار دەبێتە هۆی زانینی قەبارەی ئەو شڵەژانە لەگۆڕینی کوتوپڕی هایدگەر رویدا لەنازییەوە لەساڵی ١٩٣٣ لەو ماوەیەدا هاوڕێکانی توانیان بەیەکێك لەمفەکرە دیارەکانی چەرخی تازەی دانێن. لەتواناشیاندا نەبوو حوکمێکی ئەخلاقی دژی دەربکەن. وەها دەردەکەوێ کەهایدگەر لەترۆپکی یەکلاکردنەوە بووە لەگەڵ خودی خۆیدا ئەو دەمەی کەلەپاش جەنگ دانی پیادانا (نیتشە بەخراپی تێکیدام).

لەراستیدا زۆر گرانە بۆ مرۆڤ کە لەهایدگەر بگات بەبێ ئەوەی لەنەخشەی فیکری ئاڵۆزی ئەورووپی گەیشتبێ لەگەڵ ئەوەی کە سایەتییە فەلسەفیو ئەدەبییە بەرزەکانی بەهەند وەرگرت وەکو کیگارد، سارتەر، کامۆ، مارکس، فرۆیدو مینغنشتاین لەسەر ئەم بنەمایە هایدگەر هزریارێکە کە وزەی فەلسەفی بەخشی بەنەوەیەك کە شەیدای شۆڕشێکی رۆحی بوون، ئەو شۆڕشەی کە لەتوانای پشتگیری کردنی مێژوویی هەبێ لەپێناوی سەر لەنوێ هەستانەوە.

هەندێکیان وای بۆ دەچوون ئەم خەونە لەوانەیە لە ڕێگای ستالینەوە بێتە دی‌و هەندێکیان لەمۆسۆلۆنی و ماوتسی تونگ، بەڵام هایدگەر بەلای ئەوەوە بۆ ماوەیەکی کەم لەهیتلەر دەیبینی، کاتێك تێبینی کۆمەڵی دەکرد سەرخۆش دەبوون و دەیانڕوانیە ئەو کە بەپەیڕەی دەسەڵاتدا بەسەر دەکەوت. هەروەها لەماوەی سەرۆکایەتی کردنی بۆ زانکۆی فرانبۆرغ وەکو وەریسێکی رۆشنبیری خۆی دەبینی بۆ هەڵگیرسانەوەی سۆسیالیستی نەتەوایەتی ئەو مەبەستی لەگرنگی خۆی بوو بۆ ئەڵمانیای تازە، وەکو چۆن مەبەستی هیگل دەوڵەتێك بوو لە روسیاو ئەفلاتون بۆ شارە نموونەیەکەی‌و مارکس بۆ دەوڵەتە شیوعیەکەی لەپاش جەنگی جیهانی دووەم و لەساڵی ١٩٤٥ (لیژنەی نەهێشتنی نازیەت) کە سەیری هایدگەری کرد لەبەڵگەکانی قەبوڵ کرد بۆ بەرگری کردنی لەخۆی لەماوەی پەنجاکاندا هەندێ ئیعتیباراتی بۆ گەڕایەوە لەشەستەکاندا هەندێ بەڵگەنامەی تازە بەرچاو کەوت کە پەیوەندی بە ژیانیەوە هە بوو لە ڕێگای دەزگای ڕاگەیاندنی ئەڵمانیا بڵاو کرایەوە. بەتایبەتی لەساڵەکانی کۆتایی ژیانیدا، پاشان رۆژنامەگەری ئاماژەی دەکرد بۆ بڵاو کردنەوەی بەڵگەنامەی

نوێ کە پەیوەندییان بەلایەنی سیاسی هایدگەرەوە هەبوو، بەلاّم ئەو لەماوەی ژیانییدا توانیبووی داپۆشێ. ئەم داپۆشینە لەهەشتاکاندا تەقیەوە کاتێك فەیلەسوفێکی تشیلی بەناوی ڤیکتۆر ڤاریاسەوە لەساڵی ١٩٦٧ لەزنجیرەی خوێندنی تایبەتی ئەم فەیلەسوفە کتێبی (هادیگەری نازی) بلاّو کردەوە کە هەڵبەستێکی خراپی تیادا هاتبوو بۆ هایدگەر کە دەربارەی پەیوەندی کردنی بەجەنگی نازی هەبوو، پاش ئەوە (هۆغۆئات)ی ئەڵمانی کە مامۆستای ئابوری‌و مێژوو کۆمەلاّیەتی بوو لە زانکۆی فرانبۆرغ کتێبەکەی بەناوی (ژیانی سیاسی مارتین هایدگەر)ەوە بلاّوکرایەوە کەهێزیانی بۆ هایدگەر کەمتر نەبوو کە لەکتێبەکەی فاریاش هاتبوو، بەڵکو بەڵگەی زیاتری تێدا هەبوو لەبارەی گەرموگوڕی هایدگەرەوە بۆ نازیەت لەماوەی ساڵانی ١٩٣٣ - بۆ ١٩٣٤ کاتێ سەرۆکایەتی زانکۆی فرانبۆرغی لەئەستۆ گرتبوو (ئات) لەم کتێبەدا تەئکیدی ئەوە دەکاتەوە کەپشتگیری کرد هایدگەر بۆ سۆسیالیستی نەتەوایەتی پشتگیری کردنێکی رەمەکی نەبوو لەفەلسەفەکەشی دور نەبوو، بەڵکو چەسپێنراو قوڵ بوو، چونکە هایدگەر خۆی دەڵێ کە فەلسەفەکەی بەباوکی رۆحی ئەم بزوتنەوەیە دەژمێرێت، لێرەوە دەبێ خوێنەرانی بەرهەمەکانی هیدگەر دان بەوەدابنێن کە بیری هایدگەر بەشێوەیەکی نەکراوە نووساوە بەبینینی جیهانێکی کۆنەپەرستانە کە لەگەڵ بینینی نازیەت لەچەند بوارێکدا دەگونجێ، بەلاّم بێگومانە کە بیری هایدگەر زیاد وردو چەسپاوە لەوەی کەبەراهێنانێك لەفیکری تەبریری نازی وەسف بکرێ کتێبی فاریاس بەکتێبێکی تورەکەر دانرا، بەلاّم لەبارەی کتێبەکەی (هۆغۆئات)ەوە هاورێکانی هایدگەر کە • دەگمەن نین) بەخیانەتێکی ئەکادیمی بۆیان دەروانی، بەوردەکاری و ئەمانەت بێ بەشەو داوای دووبارە نووسینەیەوی هەدروو کتێبەکەیان کرد لەبارەی ئەو شۆرش و گفتوگۆیەی کە نایانەوە لەبارەی باوەڕ پێ کردنی ئەو باسانەی کەتیایدا هاتووە لەبارەی ژیانی هایدگەرەوە دوور کەوتنەوەیان بەشێوەیەکی گەورە لەلایەنی گرنگ و جەوهەری ئەویش لایەنی فەلسەفی و پێشکەوتنێکی لەداهاتوودا وا بەدەردەکەوێ کە ئێستا کاتی ئەوە هاتووە بۆ دەست نیشان کردنی بابەتی ترو هەڵسەنگاندی بێ لایەنە کەلەگەڵ هایدگەر مامەڵە دەکەن نەك لەبەر ئەوەی

کە لایەنگری نازیەت بوو، بەڵکو وەکو فەیلەسوفێکیش پێکەوە، ئەمیش لەسەر دەستی نووسەر رۆدیفر زافرانسکی ئەنجام درا لەکتێبە تازەکەی (هادیگەر لەنێوان چاکەو خراپە).

لەخوێندنەوەی کتێبەکەی رۆدیفر وادەردەوێ کە شارەزایی زۆری هەبێ لەبارەی ئەو مەسەلانەی کەپەیوەندیان بەژیانی هیدگەرەوە هەیەو هەستا بەپۆلین کردنی زۆربەی بەڵگەنامەو بروانامانەی کە پەیوەندییان بەوەوە هەیە هەروەها سودی لەهەردوو کتێبەکەی فاریاس و ئاوت وەرگرت و بەڵگەنامەی تری هێنایە ئاراوەو جیاوازتر لەوان بەراوردی لەنێوانیاندا کرد وانە وتنەوەی لەزانکۆی فرانبۆرغ و پەیوەندی لەگەڵ (حنا ارندت) کە قوتابی خۆی بوو لەرۆژانی بەرپابوونی جەنگ بەبلاوکردنەوەی ئەم مەسەلەی سودی لەو رۆمانە وەرگرت کە سێ ساڵ پێش ئەو سەردەمە لەئەمریکادا بلاوکرایەوە ئەو هێڵە گشتییەی کە ئەم بیبلۆگرافیا نوێیەی پێدا دەڕواو دەچێتە قولایی ناخی ئەم بابەتە تایبەتییانەوە بۆ ئەوەی لەنێوان فەلسەفەکەو ژیانی فەیلەسوفەکە تێکەلاوییەك دروست بکا لەزۆر بەشدا گەرموگوڕی و وزەی کەم تێدایە (زەفرانسکی) هەوڵی ئەوە دەدا ماوەی ژیانەوەی ئەو پەیڕەوە فەلسەفییەی هایدگەر ئاشکرا بکا لەو کاتەداو ئەو هۆیانەی کەسیفەتی بەردەوام بوونیان بەهەندێ لەتوخمی فەلسەفەکە بەخشی. زەفرانسکی هەوڵی ئەوە دەدا ماوەی ژیانەوەی ئەو پەیڕەوە فەلسەفییەی هایدگەر ئاشکرا بکات بۆ خوێنەر و ئەو هۆیانەی کە سیفەتی بەردەوام بوونیان بەهەندێ لەتوخمەکانی فەلسەفەکە بەخشی، هەروەها دەستی کرد بەگواستنەوەی تەیاری فیکری بۆ ئەو دیاردە رۆشنبیرییەی تر کە لەو کاتەدا باو بوون وەکو بزوتنەوەی رەدەی ئایدیۆلۆجی دژی دیموکراتیەتی فایمار لەئەڵمانیا ئەوجا بەراورد کردن لەنێوان فەلسەفەی (وجود)ی هایدگەرو ستاتیکای بزوتنەوەی دادائی.

بیبلۆگرافیای زەفرانکسی بەزیندویی و چالاکی فیکری بەناوبانگە، هەروەها زۆربەی لایەنە پەنهانەکانی لەژیانی فەلسەفیو کەسایەتی هایدگەر ئاشکرا کرد لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا بروانامەیەکی بەبەهایە بەڵگەنامەو شی کردنەوەی زانستی لەبارەی بیری وجودیەتەوە هەیە، پاڵپشتن بەئسلوبێکی زانستی و مەنهەجی نوێن بەدان پێنانی زۆربەی رەخنەگرە رۆژئاوییەکان بیبلۆگرافیایەکی زەبەلاحە لەبارەی کەسێکی پسپۆری گەورەی دەدوێ.

**ژێدەر**

رۆژنامەی (الحیاە) ژمارە ١٢٩٧٠ ٧/ئەیلول / ١٩٩٨

**خوێنەری ئازیز**

لەکاتی ئسمیناری (زمانەوانی) کە یەکێتی نووسەرانی کورد/ لقی هەولێر لە ڕۆژانی (٢٠،٢١،٢٢/٩/١٩٩٨) سازیدا، چەند چاوپێکەوتنێکمان لەگەڵ چەند ئەدیب و نووسەرو شاعیری میوان کرد. لەم ژمارەیەدا هەندێکیان بڵاو دەکەینەوەو خوا یار بێ لە ژمارەکانی داهاتووش پەیتا پەیتا چاوپێکەوتنەکانی دیکە دەخەینە بەر دیدی خوێنەرانەوە.

**نووسەری نوێ**




# محەمەد موکری: ئێستا چێژ لە نووسینی ڕۆمان وەردەگرم

- ئێستا چێژ لەنووسینی ڕۆمان وەردەگرم

*** تۆ جگە لەڕۆمان و چیرۆک خەریکی کاری ئەدەبی دیکەی تایا باوەڕت بەپسپۆری هەیە؟**

- بەلای منەوە پسپۆری، خۆ جەڕباندن و خۆ لەقالب دانە.

*** لەکورتە چیرۆکدا سنوورێک نەماوە بەتایبەت لەوانەی بڵاودەبنەوە رات بەمانە چییەو چۆنیان هەڵدەسەنگێنی و چیرۆکی کورت چییە؟**

- سەدان لاپەڕە لەسەر وەڵامی ئەم پرسیارە نووسراوە.. با ڕەخنەگرێ وەڵامی ئەم پرسیارە بداتەوە.

*** ڕەخنەگرەکانی چیرۆک و ڕۆمان چۆن هەڵدەسەنگێنی؟**

بەمیزاج.. یا ئایدیۆلۆژیا تایبەتیەکەی خۆی هەڵیدەسەنگێنێ کە ئەمە دەردێکی کوشندەیە.

*** چۆن لە ئێستای ڕۆمانی کوردی دەگەیت؟**

- خراپ نییە.

*** دوا ڕۆمانت چییەو تایا دەستت پێ کردووە؟**

- بەڵێ.. بەشی دووەمی ئەژدیهایە.

*** لە ئەنجامی (ئینتەمان) دەستیان کردووە بەڕۆمان نووسین لەم دواییەدا زۆریان نووسی چۆنیان هەڵدەسەنگێنی؟**

- کەمیانم خوێندووەتەوە نیمچە مام ناوەندین.

*** تۆ چێژ لەنووسینی چیرۆک وەردەگری یاخود بەلای تۆوە ڕۆمان کانگەی چێژە؟**

# عارف حیتو: نڤیسەرین بەری مە وەکو مە نە نڤیسانیە...



**★ چۆن شیعری تازەی کوردی هەڵدەسەنگێنن؟..**

– دەمێ جڤاك ژ قۆناغەکێ بۆ ئێکا دی یا پێشکەفتی تر دهێتە ڤەگوهاستن، هەمی تشت دگەل دهێنە گوهورین، ئەڤجا هۆزانڤان وەك پێشەنگ و هزرمەندەك پێشەکەفتی دێ پێدڤی ب هندەك پەیڤێن دی بیت ژ بو دەربرنیێ. هەلبەت ئەڤ شوەرشا نوی‌یا گەهاندن و راگەهاندنێ جیهان یا کری‌یە گوندەکێ بچویکێ پێگڤە گرێدای، ب ئاوایەکی یان ئێکێ دی کارێ کری‌یە سەر رەوتا ئەدەبی‌و هندەك سیمایێن دی‌یێن نووتر یێن دانیێ؟

هەر چەندە مللەتێ کورد بدرێژاهیا سەدان سالێن دیرۆکێ تەپەسەرو بن دەست بویەو کارەکی زۆر کری‌یە سەر ڤەرێژا هزراوی‌یا داهێنەر، لێ ئەڤە هندێ ناگەهینیت کوڤی مللەتی چ پێنگاڤێن پێشکەفتی نەهاڤێتینە راستە نوێخولزیێ ل وەلاتێن رۆژاڤایی لدوای‌یا سەدێ نۆزدێ و دەستپێکا سەدێ بیستێ دەست پێکری‌یەو دقۆناغێن خوەیێن هەر بەتی دا بوری‌یە، هەرچی‌یا ئەم بکەین و ئەو یێن ژێ بورین لەوا ئەم پێدڤی ب بازدانانیە، دا کو بکارین دگەل خرخالا پێشڤە چونێ بدەینە رێ.

رەوتێ نویکرنا هۆزانا کوردی پێنگاڤێن فرەه برینەو ئەز یێ گەشبینم کو ئەڤ بازدنە رۆژ بو رۆژێ دێ فرەهتر و موکم تر بن.

ئەز ڤی رەوتی دڤێ قۆناغێ دا باوک

بالبەری (موجب) لقەلەم دەدەم وبهزرا من ئەڤ پێنگاڤێن نهو دباشن و دئاییندەیدا دێ باشتر بن.

★ **رەوتی تازەگەری لەکوردستان دەستی پێکردووە، ئایا سیماکانی ئەم تازەگەریە چۆنە؟**

نڤیسەرێن بەری مە وەکو مە نە نڤێسانیەو ئەوێن ئاییندەیی ژی وەك مە نانڤیسن، ئانکو هەر دەمەکی هزرو بوچونێن خوە هەنەو ئەدەب ژی ڤەرێژا هزرو بوچونێن دەمێ خوەیە دگەل پێشبینی یێن پێشەنگ و دەستپێشخەری یێن پێشکەفتی تر. ئەڤجا ئەگەر بێژین ئەم ئەڤە هندە سالە دگومەك مەندا دراوەستاینە دێ ژ راستیێ ددویر بین، ئەگەر دهندەك ولران دا مە وەرار نەکربیت ژی، بێ گومانە کو دئەدەبیدا گوهورین و نویکرن یا پەیدابوی. ڤێ نوێکرنێ ژ دهەر قوناغەکەیێ ژ قوناغێن خوەدا سیماییێن خوە یێن تایبەت هەنە، ئانگو برادەرێن (رووانگە) سیماییێن خوە هەبوینەو برادەرێن نهو ژی سیماییێن خوە هەنەو ئەوێن ئاییندەیی ژی دێ سیماییێن خوە یێن جودا هەبن.

گوهورین دهەر دەمەکی وا ڤەرێژا هزرو بوچونێن جڤاکییەو هەر دەمێ گوهورین پەیاد ببیت هەمی لایەنێن جڤاکی ڤە دگریت. راستە لدەستپێکێ گوهورین (گاریێ)ە، لێ دگەل دەمی ودگەل راهاتنا جڤاکی دگەل وێ گوهورینێ کەهی دەبیت و دبیتە ژیانا رۆژانەیا سروشتی.

ئەو نویکرنا نهو ئەم پێ دئاخڤین لێ نێرنیەکا زانستییانەیە بو هەمی بەرهەمێن بوری‌و سەرژ نوی ئاڤەکرنەکا دییە لسەر بنواشێن هەرفاندنێ چونکە چ ئاڤاکرن بیێ هەر خاندن نابن، بڕینا سنوراو شکاندنا قالباو نەهێلانا یان گومانکرن دپیرۆزییا داو گیانێ پێگڤە ژیانێ و ئازادییا دەربڕینێ سیمایێ سەرەکێی ڤێ قوناغییە، ئانکو فەرە مرۆڤ بجاڤەکێ گومانکیو رەخنەیی هێڤ کەتە هەمی پیرۆزی و راستی یێن هەیی. چونکو چ راستی یێن رەهایی (مگلق) نینن ئەڤجا گومانکرن دتشتیدا مرۆڤی دگەهینتە راستییا رێژەییا تشتی.

لەوا من دڤێت بێژم کوفەربوو لوژیکا پرسیارێ ب دەستەولژا (دەستی پێکردووە؟-) نەبا، چونکو هەبوون و بەردەوامیا ژیانێ ئانکو گوهورین و نویکرن، لڤێرە گوهورین هەڤکیفا نوێکرنێ یە، لەوا فەرە پرسیار بڤی ئاوایی بیت (سیماییێن ڤێ قوناغێ چەوانە، ژ ئالیێ نوێکرنێ ڤە؟). نەبوونا نوێکرنێ دجڤاکی دا بگشتی و د ئەدەبیدا بتایبەتی چ تامێ بو ژیانێ

ناهیلیت. مرۆڤ وەك کومەکا هەستێن نازك ژ لایێ دەرونیڤە نەشێت پشتی تێر بوونێ ژ تشتێ هەیی دگەلدا بمینیت، هەروەسا مرۆڤ وەك گیانەك بەرهەم هێنەر دگەل ئالاڤێن نوی یێن بەرهەم هێنانێ پێدڤی ب ئامیرو پەیڤێن نوی‌یە ژ بو دەربڕینیێ.

**★ ئایا دوا بەرهەمت چی‌یە؟**

هەتا نهو من پێنج کتێب چاپکرینە. لێ دوارێ هۆزانێ دا سێ بەرهەم وەك کومەلە هۆزان من یێن چاپ کرین. یا ئێکێ ناڤێ (نان و برین و بشکورین)، یا دووێ (ئاوازێن سمفونیەکان گرچن)، یا سێیێ ژی (مەرهەبا) کولڤێ داویێ یا چاپ بوی، ئانکو بەرهەمێ من یێ سالا (١٩٩٨)یە.

**★ چۆن کاری رەخنەگرەکان هەڵدەسەنگێنی لەشیعردا؟**

کارێ رەخنەگری دهۆزانێ دا پشکداری‌یە کریارا داهێنانێ داو داهێنان دەقەکێ دی یێ ئەدەبی‌یە کو تام و منیاکەکێ خوە سەر هەیە.

رەخنەگر دڤێ کریارا داهێنانی‌دا دێ هەولێ دەت بەرادا پەیڤێ و خواندنەکا دی یا ژ پشت رێزان بو خوێندەڤای شرۆڤە کەت، هەروەسا دێ گرێکان ڤەکەت و پرتێن (بەللورا) هۆزانێ دێ پێگڤە گرێ دەت و هەمی کوژی یێن تاری دهۆزانێ دا دێ روهن کە تەڤە دگەل دەست نیشانکرنا خالێن لاوازو داهێنەر ددەقی‌دا. ئەڤ کریارە دبنە کوکا خوەدا داهێنانەکا دی‌یە هەروەك مەژێ خەبەردای، ئەڤجا فەرە ئەوێ رەخنەگر خوە دی سەربورەکا زەنگین و ئاڤز بیت ژ هەردوو لایێن ئاسویی‌و شاقولی ڤە.

لێ دەمێ ئەم دهێینە سەر رەخنەگران لدەڤەرا بادینان، هەتا بەری سەرهەڵدانێ ژی ب شێوەیەکێ گشتی رەخنە دچولرچوڤێ خواندنێن ڤالیکی (سگحی)و شرۆڤە کرنا پەیڤا فەرهەنگی دا دزڤری، ئەگەر هندەك خواندنێن جودا ژی هەبن تەمەت تبلێن دەستی بوون.

هەلبەت ڤێ چەندێ ژی سەمەدێن خوە یێن بابەتی و خویی هەنە، نهو جهێ بناڤدا چوونێ نینە.

لێ سەربورا پاشی سەرهەڵدانێ چاڤێن خواندەڤاو رخنەگران ژی زل تر لێکرینەو کویرتر دچنە دناڤ پەیڤان دا، هەر چەندە ئەڤ کریارە یا کێمە لدەڤەرا مە، لێ هەبوونا ڤی جۆرێ تێهزرینێ ئاسوەکێ گەشتر ڤەدەکەت ل هەمبەری قۆناغێن رەخنێ ل دەڤەرێ.

ئەز ل وە ناڤە شێرم کو رەخنە لدەڤەرامە یا لاوازە هەمبەر هەردوو باژێرێن هەولێرو سلێمانیێ، هەر چەندە ڤێ ژی سەمەدێن خوە هەنە، لێ بهزرامن ئەڤە وێ چەندێ ناگەهینیت کو رەخە چ

وەرار نەكرىيە بەلكو خامەيێن رەخنەگر لدەڤەرا مە ژى يێ سەر هەلددەن و سيمايەكێ پێشكەفتى تر پێڤەيەو رۆژ بو رۆژێ ئەڤ جۆرێ رەخنەيا زانستى يا ئاڤاكەر يا شوين پێن خوە لدەڤەرێ ديار دكەت و رەهێن وێ دتورێ كورمانجىدا يێ دهێنە چاندن.

**★ ئايا بزاڤى نوێخوازى لەدەڤەرى بادينان دەڵێن لەناكرێ سەرى هەڵداوە يا لەلايەكى ديكەوە . راتان چييە؟**

ل دەسپێكى من دڤێت بدەمە خوياكرن كو باژێرى دهۆكێ وەك سينتەرێك ژ ئاليێ رەوشەنبيرى ڤە هەمى دەوروبەرێن دهۆكى ژى ڤە دگريت مينا (ئاكرێ، ئامێديێ، زاخۆ، بەردەرەشى، سێميل...) لێ هەژى گوتنە كو ددواىيا سالێن هەشتێ يان دا هەولێن كەسوكى هەبوينە ژ بو شكاندنا قالبێن كەڤن و يێن بەرى خوەو سەر ژ نوسى نڤێسنا تێكستێن ئەدەبى، باشترين نموونە ژى بو ڤێ چەندێ بو ديروكى دبێژم، هۆزانڤان محسن قۆچان ل سالێن هەشتێ يان هۆزانەكا خوەيا نويكەر ل گۆڤارا كاروان بلاڤە كربوو، گەلەك دانوستاندن ل سەر هاتە كرن و ئەڤ بويەرە بۆ پالدەرەك كو رەوشەنبيرێ كورمانج ب چاڤەكى رەخنەيا زانستىو گومانكى هێڤ كەتە بەرهەمێ بورى يێ نڤێسى، فەرەبێژم كو كاك (محسن) دڤێ هۆزانێ دا ئيشارەت كربوو وێ چەندێ كو ئەڤ تشتى نڤێسى، يێ نوويەو هەر هوسايى نەهێنايە. ئەڤ كريارە (نويكرن) بەرى سەرهەلدانێ يا لاولزو لسەر ئاستێ كەسان بوو، لێ پشتى سەرهەلدانێ و بتايبەتى پشتى خرڤەبوونا گرۆپێ (نويكرن هەرو هەر) ڤێ كريارێ لهەمى دەوروبەرێن دهۆكێ دەنگ ڤەداو ڤێ گرۆپێ ژى كۆرێن هۆزان خواندنێ و سيمينارێن دەربارەى نوێكرنێ ل پرانيا دەڤەرێن دەورەبەر گێران.

ديسا هەژى گوتنە كو هەڤالێن ئاكرێ فاكتەرێن كاريگەر بوون دسەر هەلدانا نوێكرنێ داو ددەمەكێ كورتێ دياركرىدا شيان پێناسا خوە يا نووخوازو وەرگرن، كاريگەريا وان ژى پاليشتىيەكا بهێز بوو بو سەركەفتنا گرۆپێ (نويكرن هەرو هەر)، ئەڤ گرۆپە ژى ددەسپێكا كومبونێن خوەدا لسالا ١٩٩٤ ێ ژڤان ئەديبان پێك هات بوو (محسن قۆچان، سەلمان كوڤلى، د. فازل عومەر، شكرى شەهباز، د.عارف حيتو، هزرڤان) كو هەمى خو جهێن دهوكێنەو نهو بيا ڤێ كارێ ڤى گرۆپى يێ بەرفرەه بوى ويا كەفتىيە د قۆناغەكا دىيا پێشكەفتى تردا.

بكورتى دبێژم هەرچەند ڤى گرۆپێ كاريگەريەكا مەزن هەبويە د بەلاڤ كرنا رەوتێ نوێكرنێ دا لێ رەهێن نويكرنێ لدەڤەرێ ژ ڤى گرۆپى دكويرترن و دزڤرنە ڤە بو سالێن هەشتێيان.

# لەتیف هەڵمەت : لەمیهرەجانی یەکەمی شیعری کوردیدا دەریانکردمە دەرەوە.

شێرکۆ بێکەس ئەگەرچی دوو دیوانی هاکەزایی پێش ساڵانی حەفتا لەچاپ دابوو بەڵام لەسەرەتای ساڵی حەفتاوە بەگیانێکی نوێوە هاتە پێشەوە... جێی داخە ئەم یاخی بوونە لەدهۆک دواکەوت و لەناوەندو کۆتایی حەفتاکاندا سەری هەڵدا بەڵام دەبێ ئەوە بڵێم دەسپێشخەری لەم بوارەدا بۆ خۆم دەگەڕێتەوە چونکە من لەژمارە -٦- ی ساڵی ١٩٦٩ گۆڤاری (رزگاری) دا کە لەسلێمانی دەردەچوو یەکەم دەقی یاخی بووم بڵاو کردۆتەوەو دوای ئەوەش لەساڵی ١٩٧٠دا کۆمەڵە هۆنراوەی (خواو شارە بچکۆلەکەمان)م بڵاو کردەوە... دووەم کۆمەڵە هۆنراوەش لەم بوارەدا کۆمەڵە هۆنراوەی (پڕۆژەی کودەتایەکەی نهێنی) ئەنوەر شاکەلییەو دوای ئەوە لێرەو لەوێ دەقی شیعری یاخی و نوێ بڵاو کراوەتەوە...

من یادگاری ئەو ساڵانەم زۆرن و بواری ئەوە نییە هەمووی بگێڕمەوە بەڵام دەتوانم باسی هەندێکیان بکەم... بۆ نموونە: لەمیهرەجانی یەکەمی شیعری کوردیدا کەلەکەرکووک سازکرا (وابزانم ساڵی ١٩٧٣بوو) لیژنەی میهرەجان



★ لەتیف هەڵمەت دیارترین موتەمەریدی ساڵانی زووی شیعری نوێ بووە، حەز دەکەین یادگارییەکانی ئەوان سەردەمان بگێڕیتەوە؟

– سەرەتای ساڵانی حەفتاکان هێمن و ئاسوودە بوو... بوارێکی باش و لەبار رەخسا بۆ ئەوەی تەقینەوەیەک لەبواری رۆشنبیری بەگشتیو شیعر بەتایبەتی روو بدات... و گەلێ شاعیری نوێخواز هاتنە کایەوە.. لە (کەرکووک/ کفری) ئەنوەر شاکەلیو لەتیف هەڵمەت و صلاح شوان و سەلام محمدو لەهەولێر عبداللە پەشێوو سەعدوڵڵا پەرۆش و فەرید زامدارو سامی شۆڕش و عبدالخالق سەرسام و نەوزاد رەفعەت و (باسی سەرەتای حەفتاکان دەکەم) لە سلێمانی

نەیهێشت شیعر بخوێنمەوەو منیش ئاژاوەیەکم لەهۆڵەکەدا نایەوە بەزەبری پۆلیس لەهۆلەکە دەرکرام و لەبەردەرگای هۆڵەکە بەدەنگی بەرز شیعرەکەی خۆم خوێندەوەو زۆربەی ئەوانەی ناهۆڵەکە هاتنە دەرەوەو گوێیان لەشیعرەکەم گرت و لەئەنجامدا بەئاژاوەچی لەقەڵەم درام و پۆلیسی ئەمنی کەرکووك بەتومبێلێك دوام کەوتن و فڕاندمیان جگە لەمن شاعیری هاوڕێم سەلام محمدیشیان گرت...ئەگەر شەهیدی نەمر سەیدا صالح یوسفی مشووری نەخواردینایە من و سەلام محمد کەسمان رزگارمان نەدەبوو...

هەروەها مانگی تەمموزی ساڵی ۱۹۷۱یشدا لەکۆنگرەی نووسەراندا کەلەهەولێر ساز کرا رێگای من و ئەنوەر شاکەلی نەدرا شیعر بخوێنینەوە بەراستی ئەوەش غەدرێکی گەورە بوو نەك لە ئێمە بەڵکو لە شاعیرانی شاری کەرکوك کرا لەبەر ئەوە من و ئەنوەر شاکەلی بازمان دایە سەر شانۆکەو من بەدەستی خۆم میکرۆفۆنەکەم لەمامۆستا کەریم شارەزا فڕاندو کەوتمە شیعر خوێندنەوەدو جەماوەریش کەوتە چەپڵە لێدان و دوا بەدوای منیش ئەنوەر شاکەلی شیعرێکی خوێندەوەو هەر ئەو ئێوارەیە بەدزییەوە هەولێرمان جێهێشت و بەرەو کەرکووك گەڕاینەوە چونکە هەڕەشەی گرتنمان لێ کرا.. شایانی باسە شاعیرێکی دی کەرکووکی (یوسف صەدیق زەنگەنە) وەك پشتگیری کردنی ئێمە لەگەڵماندا گەڕایەوە بۆ کەرکووك..

جارێکی تریش لەساڵی ۱۹۷۲ تابلۆی بارەگای نووسەرانی کەرکووکم لەگەڵ مامۆستا عبداللە سەراج و سەلام محمەددا لەسەر دەرگای بارەگاکە کردەوەو لەکۆمەڵەی هونەرو وێژە لەلای هاوڕێیان جەلیل زەنگەنەو جەمیل جیهان شاردمەوە هەندێ کەس گوتبوویان لەتیف هەڵمەت لەسەر پردەکەی خاسەدا میزی بەتابلۆکەدا کردووە بەخوا ئەوە پڕۆپاگەندەی دوژمنان بوو.. بەڵام لەبەر ئەوەی تابلۆکە قورس بوو پەتێکم پێوەی بەست و بەراکێشان بەسەرجادەکانی کەرکووکدا گەیاندمە کۆمەڵەی هونەرو وێژەی کەرکوك.

*** شیعری ئەمڕۆی کوردی وەکو رادەربڕین دەربارەی شێوەیەکی مونەسسەتی وەرگرتووە هەرواش هەڵدەسەنگێنری، حەز دەکەین رای تۆ لەم رووەوە بزانین و چۆن شیعری ئەمڕۆ هەڵدەسەنگێنی..؟**

– شیعری ئەمڕۆی کوردی شیعرێکە شانازی پێوە بکەین و گەلێ شاعیرو دیوانە شیعرمان هەیە لە ئاستێکی جیهانیدان... بەڵام هەندێ نووسەر لەوانەی کەخۆیان نەیانتوانیوە شتێك بەشتێك بکەن رای پێچەوانەیان هەیەو رەخنەو گلەییان لەشیعری نوێی کوردی زۆرە. من رام وایە شاعیرمان هەیە لە

ئاستی خەڵاتی نۆبل دابێ...

*** سەرجەم دیوانەکانی لەتیف هەڵمەت نوێنەرایەتی تازەبوونەوە دەکەن لەشیعری کوردی. بیروڕات بۆ نوێ بوونەوەی شیعر چۆنە؟**

- نوێ بوونەوەش (لەشیعرو دەقە ئەدەبیو کارە هونەرییەکاندا) وەکو داهێنانە زانستیو پزیشکییەکان وایە هەرگیز سنووری نییە..و شیعر دەبێ بەردەوام لەقۆناغی ئەزموونی نوێ و ئەزموونگەری دابێ و ئەگەر وەستا داهێنان دەوەستێ...و ئێمە وەکو چۆن سوود لەکەرەستە شارستانییەکانی ئەوروپاو جیهان دەبینین پێویستە سوود لە ئەزموونی شیعری جیهانیو شاعیرەکانی جیهان ببینین... بەلای منەوە جوانترین شیعر ئەو شیعرەیە کە لەهەموو قالبێکی شیعریی پێش خۆی یاخی بێ... ئەمەش کەمجار روو دەدات.

*** ئایا تا ئێستا هیچ جۆرە تەنزیراتێکتان دەربارەی شیعر لەخەیاڵدا هەیەو نیەتی ئەوەت هەیە بڵاوی بکەیتەوە.**

- هەموو دەقێکی نوێ کەزادەی ئەزموونێکی نوێ بێ خۆی لەخۆیدا تەنزیرێکە بۆ شێوازێکی نوێ لەبواری شیعردا.. ئەو دەقە تازانەی کە لەماوەی چوار پێنج ساڵی رابردوودا نووسیومن و بڵاو نەکروونەتەوە زادەی ئەزموونێکی نوێن و لەخودی خۆیاندا تەنزیراتیکی نوێی شیعرین.. لەوە زیاتر وەکو نووسین تا ئێستا هیچ تەنزیراتێکم نییەو لەسەر دولرۆژ قسە ناکەم.

*** ئەمرۆ تەوژمی شیعری جیاجیا هەیە لەکوردستان، ئەگەر شتێ لەم بارەوە رابگەیەنی.**

- لەگەڵ گەشەکردنی هەموو تەوژمەکاندام لێگەرێن با رووبارەکان رێگای خۆیان ببڕن... بەلام جێی داخەمەندیێ کەس و گرووپ کەمێشتا لەسەرەتادان قسەی زل دەکەن و دەیانەوێ ماف کەسانی دی بخۆن کەجێ دەستیان بەجوگرافیای داهێنانی شیعری نوێ کوردییەوە دیارە... ئەمە دیاردەیەکی نابەجێیە.

*** تۆ چۆن شیعری باش هەڵدەسەنگێنی واتە بەچ پێوانەیەک تەقیمی شیعری باش دەکەیت؟**

- کە ریشم دەتاشم دەزانم گوزێزانەکە تیژە یا کولە...

*** دەڵێن لەساڵی دوو هەزار دیدگاییێکی دیکە بۆ شیعر تەرح دەکەیت و واشت راگەیاندووە ئایا ئەمە پرۆژەیە. یا هاتۆتە دی؟**

- لەساڵی دوو هەزاردا کۆمەڵە شیعرێکی نوێم دەخەمە بەرچاو بەناونیشانی (تەبایی و ململانێی نێوان هاوولاتییە ئەلکترۆنییەکانی لەتیف هەڵمەت) ئەم کۆمەڵە شیعرەم زادەی ئەزموونێکی نوێن و بەبڕوای خۆم ئاژاوەیەکی شیعری دەنێتەوە.

# دانەبزین... لەوێستگەی ژمارە(٢٢)

ئەسکەندەر جەلال

جلی رەشیش..

رەش.. رەش.. رەش

هەموو جار خەونی بەرەشییەک دەبینی.. ئەوانە پتریش هەمیشە رەشیان لەدڵدایە.. خۆشیان دەوێ.. بۆی دەسووتێن..

من دەڵێم لەو بیابانە وشک و برینگە کارێکی تریان نییە جگە لە گەڕان بەدوای سێبەرێکدا..

نیشتمان بەجێدێڵن و را دەکەن بەداوی نسێی قوەمتە لێکدا..

سوڕان و گەڕان و ژیان لەبیابان هەر دەبێ بۆ دۆزینەوەی پنتکە سێبەرێک بێت..

کاتێک سێبەرێک دیار بێت لەدوورەوە ئەوان بەداویدا رادەکەن بگرە شوێنی خۆشیان ترۆ دەکەن..

رەنگی رەش بۆتە خولیایان... ئەوتا جلی رەش لەبەردەکەن..

رەشماڵەکانیشیان لەرەشماڵی ئێمە دەچێ و رەش رەش..

ئاخر مەملەکەتەی وان تا چاو هەتەر دەکات هەر لەو هەر سپی دەچێتەوە..

خۆی و رەبابەکەی دەستی و تورەگەکەی کۆلی لەبەر ئەو خۆرە دەڕۆیشت ماندوێتی هەنگاوەکانی پێ خەست کرد بۆوە.. هیلاک هیلاک بوو.. رەشێتی سێبەرێک بۆ ئەم هەموو دنیای دەهێنا لەو نێوەڕۆ گەرمەدا..

شەکەت شەکەت هەنگاوی دەنا.. خۆزگەی دەخواست بگاتە سێبەرێک و لەسایەیدا لێی پاڵکەوێ..

گەردەلوولیش وەک رۆژان لەهەڵکردنی خۆی نەدەکەوت، لەدوورەوە گەردەلوولێکی نائاسایی هەڵی کرد، ئەم هەستی بەنائاساییەکە کرد بەس هیچ حسێبێکی نەکرد..

نزیکتر بۆوە.. ترومبێلێک بوو.. جێبێکی ئینگلیزی... سوار بووەکانی وەک خۆی بیابانی بوون..

ئۆقرەیەک هاتەوە بەری.. خۆشە لە رێگە تووشت بن و هەڵتگرن بەس نەخێر.

خۆیان تورە کرد.. بەسەریدا قیژاندییان.. بەشاخاوییان ناودەبرد، خۆشیان هەمان عەگالی چەشنی ئەمیان لەسەر بوو..

جلیان وەکو ئەم رەش بوو.. خەونیشیان هەر بەسێبەرێکەوە بینیبوو نەیانهێشت بەرەنگاری بکات.. لەجێبەکەیان پەستا..

تورەگەکەیان لەدەست دەرهێنا...

ترومبێلەکە جولا.. رەبابەکەی گرتە دەست.. کەوانەکەی دەهێناو دەبرد دەنگێکی زۆر خەمناکی لێ هەلدەستا... عەتابەیەکی پڕ حوزنی دەچڕی. غوربەتی لەدەنگەکان دەرژا..

ئەم لەگەڵ عەتابەکەو لەگەڵ تەلی رەبابەکە سەری دەهێناو دەبرد ئەوان عەتابەکەیان بە گوێدا ئاشنابوو، باسی لەو سێبەرە دەکرد کەئەوانیش سالانێک بوو عەودالی بوون..

ئەم سەری بۆ سەر لمەکە شۆڕ کردەوە.. تنۆک تنۆکیش خوێنی بۆ ئەو لمستانە هەلدەڕشت کە زەمانێک بوو لەسەریدا عەودالی سێبەرێکی رەش رەش هەنگاوەکانی پێ گورجتر دەکرد..

پێچی کردەوە راچلەکیم..

سەیرێکی کاتژمێرەکەی دەستمم کرد نزیکی کاتژمێر (٢٢) بوو.. کەواتە کاتی دابەزینیشم هاتبوو.. دەبوایە برێکی تر دابەزم، دەبوایە کتێبەکانم هەلگرم و جانتاکەم بکەمە شان هێدی هێدی بۆ لای دەرگاکە بخزێم..

شەش رۆژ لەوێ بووم ئینجا سواری پاسێک بووم، لەشەشەم وێستەگە دابەزیم هیچ رووی نەدا.. رێگەکەش رێگەیەکی زۆر جوان و خۆش بوو..

بەنێو دارستانێکدا رێمان دەکرد.. لە پشتیەوە ئەم بەرو ئەوبەری شەقام زنجیرە شاخی بەرز بەرزی گەردەن کێل بوون.

هەر لێیان رادەمام ئەو بزن و کێوییانەشم دەبینین کە بەقەد پالەکەوە بوون.. بەقەدیدا هەلدەزنان و هەلپەزودابەزییان دەکرد، قەستم دەکرد تێکەلیان بم.. منیش بەبالای زراقی ئەو شاخە گەردەن کێلانەدا هەلزەنیم..

ودلێ ئەفسوس.. رێگەکە دژوار بوو هەر دەبوایە بیبرم.

من دەمویست شێر بم نەک بزن.. کەچی هەموو جار دەیانگووت، تۆ پلنگ بە.. بەقسەی کەسیانم نەدەکرد، دەستەکانم دەخستنە گەڕ وەکو هێمای فڕین، یەکێکیش دەیگووت: ئەمە هەلۆیە هەلۆ..

ئەو شەش وێستگەی سەرەتام بڕی و سواری پاسێکی تر بووم. ئەمیشیان رێگەیەکی کورت بوو و دابەزیم.. سواری پاسێکی تر بووم. ئەمیان وێستگەی کۆتایی کەوتبووە دوای پەڕینەوە لە جۆگەیەکی باریک.. ئەویش تەواو ئینجا ئەم پاسە لەعنەتیەی کۆتایی... خەبەرم بیۆوە نزیک وێستگەی کۆتایی بووبووم..

گوتم: دابەزین هەیە

سەکنەکە... کوڕێکی بێ کەلک بوو.. تەماشایەکی کردم.. هیچی نەگووت گوتم: بەلێ دابەزین هەیە.

بەهەمان تەرز سەیرێکی تری کردم، ئنجا چووە لای شوفێرەکە.. هەندێ پستە پستیان کرد، سەیرێکی تری کردم و رووی وەرگێرا...

خۆی دەخیلی شانی شوفێرەکە کرد..

هەستامەوە: کاکە دادەبەزم
سەکنە کوێرەکە خۆی لە گێلی دا وێستگەی خۆم بەجێما..
خەڵکەکە هەمووی لێم رادەمان.. لەنیگایان حاڵی دەبووم دەمزانی هەموویان دەڵێن:
وەیش غەریبەی زوڵمیان لێکرد..
چی دەکەیت، ئەو سەکنە شەلاتیە کوێرە ناڵێ بوەستە..
پەنجەرەکەی تەنیشتمم کردوە، سەرم بردە دەرەوە..
سەرنجێکم گرتە ماڵەوەم ئەو ماڵەی کە هەر چوار دەوری دەرگان.. ئەو ماڵەی کە لەژوورەوەیدا لەهەر چوار لاوە دەرەوەم لێ دیارە.. تەماشایەکی قوڵ قوڵم کرد..
دەبوایە دابەزیبام هەرزوو دەرگاکانم ئاوەڵا کردبان..
هەر زوو تۆزی سەر وێنەکەی دایکمم سڕیباوە..
ئەو دایکەی بەر لەمردنی و لەسەرپێخەفەکەی هەمیشە فێری دەکردم بزانم کە دەبێ تەنها هەڵۆ بیت.. ئینجا ئەو هەموو دنیایە دەبینی.. هەموو جار دەیگوت: کوڕم ئەمە چەند جارە لێت دووپات دەکەمەوە.. کوڕێکی دمۆر مەبە.. لەکەس مەبورە.. هەمیشە تۆڵە بکە بەرێنمایی کارت... ئەگەر رۆژێک هەڵەیەکت بەرامبەر خۆت ئەنجام دا، فێربە لەخۆت نەبوریت.. فێربە خۆت سزا بدە، دوا قسەشی بەر لەمردن پێی گوتم: لەبیری مەکە کە هەڵەت کرد خۆت سزا بدە.. گەر هیچت پێنەکرا، رۆژێک قسە مەکە.. ئەمە سوکترین سزایە کە لەکاتێکدا هەڵەیەک بەرامبەر بەخۆت دەکەیت بەسەر خۆتی دا بسەپێنی...
سەرم هەر لەدەرەوە بوو.. رووم هەر لە ماڵی پڕ حەسرەت و پڕ حەژمەتم بوو.. ئەو ماڵەی کە دەبوایە لەبەر دەرگەی دابەزیبام و لەسەری رەت نەبیام..
ئەو ماڵەی کانگەی بوون و ژیان و رابردوومە..
ئەو ماڵە پارچە پارچەی داهاتووشمی تێدایەو بەچەشنی شەمشەمە کوێرە بەتاقەکەوە خۆیان هەڵواسیوە..
لەنێو ئەم ماڵەدایە من هەموو شتە بزرەکانم دەدۆزمەوە.. ئەو کوێرە شەلاتیە لێنەگەڕا لە وێستگەی خۆم دابەزم..
کوێرەی کافر نەددکرا قەت تۆ کوڕی بولبول بیت و خۆشت شاگردە سەکنێکی حەب خۆر..
ئەی نەفەرەکەی پشتەوە ناڵێ: شەو تا بەیانی حەب لێدەداو لەژێر پردەکە دەمێنێتەوە..؟
چەندی هاوارم کرد لە وێستگەی خۆم داینەبەزاندم کە وێستگەی ژمارە (٢٢) بوو..
ئا لەوان کاتان بەر لەوەی بگەینە وێستگەیەکی تر..
دەنگی رەبابەی بیابان نشینەکەم کەوتەوە بەر گوێ..
بەدەست خۆم نەبوو چەند تنۆکە فرمێسکێک چاوەکانیان تەڕ کردم قسەی سەرە مەرگی دایکیشم تێکەڵ بەئاوازی رەبابەی بیابانشینەکە دەبوو.. هێدی هێدی گورج دەبوومەوە..

كورتيله چيرۆك

# تيماسكێ * له هێشوی كورتيله چيرۆك

د. لەتیف محەمەد حەسەن

## مامۆستا.... مامۆستا

پاسەکە لەوێستگەکەدا وەستاو، دوو کیژۆڵەی قردێلە بەسەر دایکیان بەرێی کردن، بەچاوی فرمێسکاویەوە سەرکەوتن، لەوێستگەی ئەولاتر ئافرەتێک سەرکەوت بەسەرکەوتنی گریانیان بوو بەبزەو پێکەنین، سەیری یەکیان ئەکردوو ئەیان وت: ئەها مامۆستا... ئەها مامۆستا... مامۆستاش ئەلای کردەوە بەلایاندا و ئەوەرتەیەکی لێوە هات...

(١٩٨٦/١٢/١٣)

## هەڵخەڵەتان

دەماو دەمی ئێوارە بوو، لەسەر سەربانەکەیانەوە هەر سەرە قوتێی بوو، پەیتا پەیتا بەم لاو لادا ئەیڕوانی، لەچاوەڕوانیدا ئۆقرەی لێ بڕابوو، لەپڕ لەسەر سوچی کۆلانەکەوە هاوڕێی ئەو کەسەی چاوەڕوانی دەکرد دەرکەوت، ئاهێکی پێدا هاتەوە، وای زانی ئەوی لەگەڵدایە، بەستەزمانە نەیدەزانی ئەو لەعەسرەوە چووبوو بۆ لای خۆشەویستەکەی!!

(تەموزی ١٩٨٧)

## خۆفرۆشتن

سێ چوار سەگ بەقوروسکە قوروسک رویان کردەماڵەکەی، لەبرساندا پەلاماری داروبەردیان دەدا، ئەویش دار لاستیکەکەی هەڵگرت و کەوتە کوشتنی باڵندەی سەر لق و پۆپی باخچەی ماڵەی تا تێریان بکات...

(ئابی ١٩٨٧)

## قەفەز

هەموو رۆژێک بەبەردەمی مالّەکەیاندا تێ دەپەڕم... ئاغا قەفەزێکی گەورەی لەبەردەمی مالّەکەیاندا داناوە... بەبیرم دێ رۆژێ لە رۆژان نەمالّی ئاغاو نەقەفەز لەم گوزەرە نەبوون. دوێنێ بینیم پڕ بوو لەمەڕ... ئەمڕۆ پڕ بوو لەسەگ، جا نازانم سبەینێ چی تێ دەکاو چی تێ دەچێ؟!

(١٩٨٧/١١/٢٣)

## دەرمانی مێش

چووم بۆ بازاڕ، کابرایەکی کوێرم دی. لەوە دەچوو تازە کوێر بووبێت. دوکان بەدوکان دەگەڕا چی پارەی مەڕو بزنە بەتالآن فرۆشراوەکانی پێ بوو دەیدا بەدەرمانی مێش، و پاشان بەپێلەقە دەکەوتە شکاندنی قوتوی دەرمانە مێشەکان. بەستەزمانە نەیدەزانی بازرگانەکان سەر لەنوێ بۆ سبەینێ دوکانەکانیانی لێ پڕ دەکەنەوە...

(١٩٨٨/٤/٢٤)

## لێ قەومان

لەبرسانا مرد، خۆراکیشی پێ بوو، بەلاّم دایانابوو بۆ لێ قەومانێکی گەورەتر...

(مایس ١٩٩١)

## بوون و هەبوون*

مالّی کیژی داواکراو، وتیان: دەبێ چاومان بەکوڕی خوازبێنیکەر بکەوێت کوڕ کەچوو، دانیشت و دانەنیشت، دایکی کیژ دەمی کردەوەو نەکردەوە وتی: کوڕم تۆ چیت هەیە؟

کوڕە.... باش واقی وڕما. هەر چەندە خاوەنی زۆر شت بوو. وتی: من خۆمم هەیە.

دایکی کچە وتی: من وتم چیت؟ لەوە دەچێت لەپرسیارەکەم نەگەیشتبیت!!

کوڕە وتی: ئامۆژن باش لەپرسیارەکەت گەیشتم، لەوەدەچێت جەنابت لەوەلاّمەکەم نەگەیشتبیت. بۆیە دووبارە پێت دەلێم: من تەنها خۆمم هەیە... ئیتر کوڕە هەستاو بڕیاری دا چی تر مالّەکەیان نەبینێتەوە...

(١٩٩٨/٨/١٦)

* تیماسک: لقێکە لەلقەکانی هێشوی ترێ کە چەند بۆلێکی پێوەیە.



# ژەمێکی پێش لە سێدارەدان

نووسینی/ هیربرت هیکمان        وەرگێڕانی/ جەلیل کاکەوەیس

کاتێ ئەو پرسیارە سواوە کرا: (ئاخۆ دوا ئاواتی چییە؟) بێ پێچ و پەنا وەلامەکەی ئاوهابوو: تاقە ئاواتی ئەوەیە بەر لەوەی بەرەو سێدارەی بەرن بۆ تەنها جارێک تێر بخوات. (تا تێر دەخوات)ی دووبارە کردەوە، ئینجا بەخۆدانە سەرشیشی زیندانەکەوە ئاماژەی بۆ زگە خاڵییەکەی کرد، تەنها شتێکیش کەخۆی پێدادەپۆشی بنمیچی زیندانەکەبوو. (تا تێر دەخوات)یشی بۆ سێیەم جار گوتەوە. ئینجا هەردوو دەستە کۆت کراوەکەی تا لێوار دەمی بەرزکردەوە.

پاسەوانەکان جەقەنگیان پێ دەکردو بەڵێنی خواردنێکی شاهانەیان دەدایە، خوانێک کەقاپ و کەوچک و چەتاڵەکانیشی لەزێڕن. بەتەرحێکیش جارێکی دی نەتوانێت دزی کردن تاقی بکاتەوە. (ئێمە خواردنێکت دەدەینێ، ئەوسا دەردەکەوێت شەروالەکەت چی بەسەر دێت!) بۆ ئامادەکردنی خواردنی باش و حەز بزوێن فەرمان دەردەکرێ، لەهەموو جۆرە خواردنێک، تەنانەت لیکاوی ئەو کەسەش دەرووژێنێت کە فەرمانی لەسێدارەدانی بۆ دەرچووە. فەرخە بەرازێک، گایەکی سورە کراو، دەونگی مەڕێکی قەڵەو، باڵندەی کوڵاو و کەڵەبابەبێکی خەسیوی قەڵەوت دەدەنێ.

کەنێچیرەکەیان رووی وەرگێڕا ئەمان چاویان لەیەکدی دادەگرت. دووبارە لەتەک خۆیدا دوا... ئەو کەسەی لەسێدارە دەدرێ دەتوانێت بیر لەهەموو شت بکاتەوە.. هەموو شتێ.. ئەوەی لەدەورو بەری دایەو دەخورێ... دەمی داچەقانە سەر شیشەکە، لێوەکانی لەسەر شیشەکە بەتەرحێ کرۆشت خوێنیان لێ هات.. بڕستی لێ بڕاو خەونی بەدەم گەلێکی کراوەوە بینی... کاتێ بۆ خواردن وەئاگایان هێنایەوە، ویستی دەست بۆ کەوچکەکە بەرێت، ئینجا خۆی لەقاپلەمەکە نزیک کردەوە، ئیدی هالاوی خواردنی ناوەخندار بەرەو تفناکی وروژمی هێنا. پاسەوانەکان لێی نزیک بوونەوەو چاودێرییان دەکرد، بینیان چۆن لەکەوچکەکە دەگەڕێت، چۆنیش بەهێواشی دەستی پێ کردو دەستەکانیشی دەلەرزین. دوای ئەوەی دڵنیا بوو کەوچکەکە لەنێو قامکەکانیدا جێگیر بوو..

گوێیەکانی ناوسان. ؟ لەسەرەخۆ خواردنەکەی دەجوی، لەگەڵ هەر جوینێکدا چاوێکی گشتگیری و پشکنیناوی دەگێڕا.. دوای کەمێک قاپلەمەکان پتر بوون و قاپلەمەی گەورەتریشیان بەدوادا هات. کێشی قورس بوو، وەلێ لەگەڵ ئەوەشدا برسێتی هەر هاواری دەکرد، بانگی دەکرد: هی دیکە نییە، ئینجا هەردوو باسکی بەتوندی بزوان و کۆتەکان زرنگەیان لێ هەستا، پاسەوانەکان هاواریان کرد (دەشێ خواردنەکەت بەدڵ بێ!)، سەر لەنوێ قاپلەمەی دیکەو شووشە شەربەتی مێوژیان بۆ هێنا.. کە دیتیان نێچیرەکەیان راست بۆتەوەو خۆراک لووش دەکات، لەقاقای پێکەنینیاندا... کاتێ لەنێوخۆیاندا لەسەر ئەوەی ناخۆ دەتوانێت چەندی دیکە بخوات، گرۆیان کرد، لەپڕ هاواریان کرد (پێک هاتین).

نکاوەکە ئەو دەمە دەرکەوت کە ئەم هەر دەیجووی و قووتی دەداو ئەوەی بۆیان دێنا لووشی دەکرد.. پاسەوانگەل گوتیان: ئەمە لافاوی بەفری تواوەیە. بەهاوارەوە گازی کرد (هی دیکە نییە؟) ئیدی ئەوەی بۆیان دەهێنا خواردی.. خواردی و خواردی.. هەموو گوتیان (تەنانەت کلاو تووکی سەریشمان دەخوات). لەوە سەرسام بوون کە بینیان لەوەی چاوەڕوانیان دەکرد بەلەزتر لووشی دەکرد.

هێندەی نەبرد کۆتەکانی دەست و پێی شکان، زگی دەکشاو گەورەتر دەبوو، ئەمیش بەئیشتیاوە هەر دەی خوارد.. تا دەهات زەبەللاح و زەبەلاحتر دەبوو، سەری لار کردەوەو هەردوو شانی بەر بنمیچی زیندانەکە دەکەوتن. کورسییە دارینەکەی ژێری وردو خاش بوو، بە رووتی بەپێوە وەستا. کە پاسەوانگەل دیتیان ئەوەی بۆی دێنن لووشی دەکات، لەزیندانەکە هەلاتن، هاواری کردەوە برسیمە، بەمە هەموو لەبەردەمیدا بەترس و لەرزەوە رایان کرد. بنمیچەکەو چوار دیوارەکەی دەوری بەسەر سەریدا روخان و ئەو مێشیشی میوان نەبوو. ئەو لەراکردنی پاسەوان و داروبەردا بەردەوام بوو، ئینجا پەلاماری خانوو و شەقامەکانیشی دا... لەپاشان قازی و ژنەکەشی قوت دا.. کە تینووی بوو ئاوی رووبارەکەی هەموو هەڵلووشی.. سێوەکەی ئادەم لە ئەوکیدا بەجۆرێ ئاوسا بەقەد زەنگوڵەی کڵێسای لێهات.. وەلێ سێبەری لەشی هەردەکشاو هەموو زەوی داپۆشی. منیش بەگوێرەی ئەو کاتەی بەدەستمەوە ماوە ئەوەی دەیبینم تۆماری دەکەم، چونکە گوێم لێیە دەنگێکی بەهێز وانزیک دەبێتەوە، هەستیش دەکەم زەوی لەژێر هەنگاوە قورسەکانیدا دەلەرزێ..

(ئای.. گەر برسێتی رەحمێکی دەبوو).

---

* هیربرت هیمان: چیرۆکنووسێکی ئەڵمانییەو لەساڵی ۱۹۳۰ لە فرانکفۆرت/ ماین لەدایک بووە. ئەلسەفەو ئەدەبی لەزانکۆی ئەم شارەدا خوێندووە. لەزانکۆی مونسترو هایدلبرگ مامۆستاو لێکۆڵەرەوە بووە. وەک مامۆستایەکی میوان لەنێوان ساڵانی ۱۹٦٥ ـ ۱۹٦۷ لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەرسی وتووەتەوە. لەبواری چیرۆک و رەخنەو نواندنی تەلەفزیۆنی کار دەکات.

**لەکۆمەڵە چیرۆکی (قبو البصل)ەوە ئەم چیرۆکەو ژیاننامەیە وەرگێڕاوە**

# کەوچکە زیوەکان

**نووسینی: ئەلێکسی رێمیزۆف**

**گۆڕینی لە ئینگلیزیەوە: هۆشەنگ فاروق**

**(بەشی یەکەم)**

سێ رۆژ لەمەوبەر بوو کە پێڤستۆڤ لەزیندان ئازاد کرا. بەهەڵەداوان لەسەر تاسەری شار دەسوڕایەوەو لەخانمانی خاوەن خانوو دەپاڕایەوە ژوورێکی بەکرێ پێ بدەن تا کاتی یەکلا کردنەوەی کێشەکەی دێن. شتێکی ئەوتۆی نەدەکرد؛ لەگەڵیان پێکهات و لەسەر پلانەکە رازی بوو، بەلاّم هەر لەگەڵ باسی دەهاتە سەر پاسپۆرت ـ پەردەکان بزر دەبن! هەڵبەت دەیتوانی لە ئوتێلێک بحەوێتەوە، بەلاّم خۆ ئوتێل وەک ماڵ نییە. گەر بزانن گیرفانت گەرمە ئەوا دەرگاکانت زۆر بەرێزو بەپەرۆشەوە بەروودا دەکەنەوە.

ئای لەو شارۆچکانە چەندە گەرمن، برێکی باشی کاهووشیان تێدایە؛ ئەوکات بارودۆخ باش بوو و دوای کارەساتەکەش هێشتا شوێنەوارەکەی بەسەر ئەم شارەوە دیارە. رەنگە لەرێگاو لەژێر تەلێکدا گیانت بسپاردبا، کەس خۆی سەغڵەت نەدەکرد؟

پێڤستۆڤ بڕیاری دا چاوی بەبرادەرێکی بکەوێت. هەرچی روویدا، روویدا، لەوانەیە بیری بکەوێتەوە، بەلاّم باش دەبێ.

برادەرەکەی لەماڵەکەیدا بینی.

بەیەکەوە دەستبەجێ لای سەماوەرەکە دانیشتن.

پێستۆڤ گۆڕانی گەورەی لەخێزانەکەی تیۆخۆڤدا بەدی کرد. ماڵەکە بەتەواوی سووتابوو و یەکێکی دیکەیان بنیات نابووەوە. فیۆدۆر پێترۆڤیچ کۆتایی بەخوێندنی زانکۆ هێنابوو و کێشی زیاد کردبوو و داپیرەشی بەشیشەیەکی ئاسنین حوکمی بەسەردا دەکرد.

ئەم دوو هاوڕێیە لەبالکۆنەکەدا ئەوەی لەسەماوەرەکەدابوو هەڵیانقوڕاند، بەخۆشییەکی زۆریشەوە چایان فڕ دەکرد بەرادەیەک ئارەقیان دەردەدا.

لەخوارەوەش گەردەلوولی تێکچڕژاوی تۆزو غوبارێک روو قامانە شارەکەی دەبڕیو بەملاو

بەولادا گوزەری دەکرد بەجۆرێک دەمیان پڕ وردە بەرد بوو بوو لووتیانی ختووکە دەدا، تۆزو ئارەقی سەر لەشیان جۆرە چەورییەکی لەسەر دەست و دەم و چاویان پەیدا دەکرد.

دوای ئەوەی ملە درێژو باریک و چاوە کزو قووڵەکانی بەملاو بەولادا گێڕا، پێڤستۆڤ دەستی کرد بەگێڕانەوەی ژیانی ڕۆژ بەڕۆژو بەوردەکارییەکی زۆرەوە هەموو ناهەموارییەکانی ئەو سەردەمە درێژەی بەندیخانە بەسەری بردبوو باس کرد.

بێ دەنگییەکی درێژخایەن زمانی بەستبوو، وشەکان لەشوێنێک لەگەروویدا دەربازیان نەدەبوو و گەوهەری ئەوەی دەیویست بیڵێ لەبەردەم لووتیدا هەڵدەبەزییەوەو بەشێوەیەکی گاڵتە ئامێز و بەردەوام خۆیان لادەدا.

فیۆدۆر پێترۆڤیچ بەردەوام سەری ڕازی بوونی بۆ دەلەقاند.

بەڵام ئازادیان کردم پێڤستۆڤ بەردەوام بوو بەهەندێ مەرجی وا کە کەس نییە تێیان بگات.

کۆلۆنێلەکەی ئێمە کە بەرپرسیاری کێشەکەی من بوو پیاوێکی ناوازەو کەللە ڕەقێکی بێ وێنە بوو.

من بۆ لێپرسینەوە دەبردرام ئەویش لە ژوورەکەی دیکەدا خەریکی پیانۆ لێدان بوو بۆ کچەکەی. یان باسی ئەوەی دەکرد چۆن چۆنی چۆتە ئەو شانۆگەرییەی ئێوارەکەی پێشوو ترو چی دیوە. جاری واهەبوو لەشوێنە ناسکەکاندا دەستی بەهاوار دەکرد، هەندێ جاریش تۆزێک دەگریاو بانگی یەکێک لەپیاوانی دەکرد کە بۆ زیندانم بگێڕنەوە. دواجار لەبەیانییەکی زوودا بۆ لای کۆلۆنێلیان بردم. هەر خوا دەزانێ چ خۆشیەکی پێ بەخشیم. بۆ ماڵەوە داوەتێکی کردم، کەئێوارە داهات پرسی:

حەز دەکەی لەگەڵم بێیتە شانۆگەری ئەمشەو؟ منیش بەبەڵێ وەڵامم دایەوە.

داوەتێکی دڵخۆشکەربوو کەواتە دەڕۆین، خەڵکانێکی زۆر لە شانۆگەرییەکە بوون.

تەنها بەشی یەکەم دەبینیت و دواتر بۆ زیندان دەگەڕێیەوە کۆلۆنێل ئەمەی پێ گوتم و بەرەو شوێنەکەی خۆی چوو، پاشان کتوپڕ خۆم لەنێو حەشامەتێکی بێ هەژماردا بینیەوە؛ بەڵێ بەتەنها. بەسەرسوڕمانێکەوە لەوێ وەستابووم، هەزارو یەک بیرۆکەم بەمێشکدا دەهات، چەندان نەخشەو پلان بەفکرمدا گوزەریان دەکرد. نەمدەویست چی دی رابکەم بیرم کردەوە کە تازە ماوەیەکی دوورو درێژە رامکردووەوە ئێستا لێرە وەستاوم و هاتوومەتەوە. دووبارە دەستگیر کرابوومەوە، نا، تا ئێستا نا، بەڵام هەر کاتێک بیانەوێ دەیکەن، پەردەکە دادرایەوە بەشی یەکەم تەواو بوو. دەست کرا بەمۆسیقا لێدان. کۆلۆنێل دەرکەوتەوەو گوتی: بابڕۆین؛ پیاسەیەکی کورت دەکەین و دواتریش بەرەو پیشانگەکە دەچین. گوێ لەو کچانە دەگرین کە گۆرانی دەچڕن و پاشانیش هەڵبەت تۆ بۆ ژوورەکەی خۆت لەزیندان.

دەستمان بەپیاسە کرد، خەڵک لەملاو لەولادا دوەستابوون و چاودێرییان دەکردین. تەواوی ئەو حەشامەتە وەک تەنها چاوێک لەئێمەیان دەڕوانی. بەدەوری شانۆکەدا سووڕاین و

دواتر بۆ لای پیشانگەکە چووین، من دەهەژام و ئەژنۆکانم دەلەرزین. بەدەوری پیشانگەکەدا پیاسەیەکمان کرد. چەند کچێک گۆرانیان دەگوت و وەک ئەوەی لەنێو تەمومژو هاوارو فیغانێکدابم دەنگی کۆلۆنێلم بیست. هەمان رستەو دەستەواژەکانی خۆی کە لەلێپرسینەوەی مندا بەکاری دەهێنان ئەو بەیانیە کچۆڵەکان بەردەوام بوون لەگۆرانی چرین و مۆسیقاکەش درێژەی هەبوو، لێپرسینەوەی ئەو لەگەڵ ئاوازو مۆسیقاکە تێکەڵ ببوو، لەناکاو کۆلۆنێل قسەی پچراندو قۆڵی گرتم و گوتی: بۆ کوێ ئارەزوو دەکەی برۆ، چەندە دەتوانیّ خێرا برۆ، من بۆ نێو ئەو قەڵەبالغییە دەچم.

ئەوا پارێزگار دەبینم کە بەرەو لام دێت، پرسیارێک لەکۆلۆنێل دەکات و ئاماژە بۆ من دەکات. بەلاّم کۆلۆنێل ئەم رەت دەکاتەوە. من چی دی لێرە نامێنمەوە دەچمە شوێنێکی دیکە. کچەکان گۆرانی دەڵێن و یەکێکی دی دەڵێت: تۆ جاسوسی.

تێدەگەم، تێدەگەم لەهەموو شتێک دەگەم.

گەردەلوولە گەرمەکە بەهێمنی ی بەردەوام بوو بەشێوەیەک کە ئاسۆی فراوان و کێڵگە زەردو دارستانە سەوزەکانی لەبەرچاوان لێڵ دەکرد.

**(بەشی دووەم)**

لە ژیان لەگەڵ خێزانی تیۆخۆڤدا هیچ شتێکی نائاسایی نەبوو هەروەک ئەوە وابوو لە باوەشی مەسیحدا بیت، تەنها تاکە گرفتێک هەبوو ئەویش داپیرەی تیۆخینا بوو کە جڵەوی دەسەلاّتی لەدەستدا بوو.

شەو و رۆژێکت تێپەر نەدەکرد کە ئارامیی بەخۆوە ببینیّ لەدەست ئەم پیرەژنە.

هەمیشەو هەموو دەمێک پرتەو بۆڵەی دەهات.

بەلای ئەوەوە هیچ شتێک لەجێی خۆیدا نەبوو. ئەریّ ئەو شەپۆلی گەرمایە چییە پەیدا بووە. باران یەکجار دەگمەنە، ئەو مێشوولانە بۆ گزەگزیانەو هێندە گاز دەگرن، ئەریّ بۆ غەریب و نامۆیەکی وا بیّ پاسپۆرت بۆ نێو ئەم ماڵە دزەی کردووە؟

پیاوی لەم چەشنە هەتا پارەش تەزویر دەکەن، ئەی تەڵەکەباز پیرەژن بۆڵەیەکی کرد.

گەر پێکەوە لەسەر مێزەکە دانیشتبان ئەوا گفتوگۆ تەنها لەبارەی یەک بابەت بوو، ئەویش ئاگرەکە بوو، ئەو ئاگرەی ساڵی پێشووتر هەلاّیسا بوو و داپیرەش هەر لەو ساوە لەدەست ئاکامەکانی دەیناڵاند.

- خوایە ها! ماڵ و سامانەکانمان، ئەو سەروەت و ملکەی گڕی ئاگر هەڵی لووشین

- فیدیۆشا کە گوێی لیّ بوو هات بۆ لام و لەسەری رۆیشت (ئاگرە لەسەرەوە هەلاّیسا من لەخەوێکی قووڵدابووم داپیرەم لەخەو هەڵساندن و هەڵم گرتەوە وەک چۆن منداڵێکی شیرەخۆر بگوازمەوە. پووتە نوێیەکانی فیدیۆشا ئەوانەی کە لەپیترۆسبۆرگی هێنابوو، دەستە

جلوبەرگەکەی و هەموو سەرپۆشەکان ئاگر هەڵی لووشین). خوایە گیان شتوومەکەکان، ئەو کەلوپەلانەی ئاگر قووتی دان!

- فیۆدۆر پێترۆڤیچ فوویەکی کردو وەک پشیلەیکی برسی دەستی کرد بەنان خواردن.

- دوای نانی ئێوارە، چای ئامادە دەکرا. دەبووایە لۆکەیەکی زۆر لەگوێت بئاخنی و خۆت کەر بکەیت، چونکە داپیرە بەبەردەوامی توانج و تەشەری دەهاویشت.

- (مەسروف زۆر گران بووە، پیاو لەبن دێنێت، فیدیۆشکا ئەو برادەرە نزیکانەی تۆ. نرخی شەکریش لەبەرزبوونەوە دایە).

- داپیرە بەردەوام بوو لەسەر پرتەو بۆڵەو سکاڵای لەسەر شتی هیچ و پووچ تاکو ئێوارە، بواری هێمنیی نەدەما تا شەو رانەشکاباو پیرەژن خەوی لێ نەکەوتایە.

- پێڤستۆڤ دەچووە دەرەوە، لەکونجێکی باخچەکەی تیۆخۆڤدا دەگیرسایەوەو چاوەڕوانی شەوی دەکرد.

- شەویش بەنووزەو بریسکەو ئاخێکەوە وەک رۆژانی هاوین هەڵی دەکرد، تەمێک بەرز دەبوەوە، هاشوهووش و هەرای نێو شار نەدەماو دوایین دەنگ و جوولەکان خەفە دەبوون.

- شتێکی کپ بە نەبینراوی لەژێر سێبەری ئەو گەڵایانەدا دەژیا کە لەژێر دار سێوە گەییوەکانەوە خەویان دەبینی هەروەک ئەوەی پاییزی داهاتوو تازە بیەوێ هەوەڵین نیگا کزەکانی لەگەڵ زەویدا بگۆڕێتەوە.

- (تۆ جاسوسی!) رەنگە یەکێک لەم تاریکە شەوەدا ئاوەها بڵێت.

- (نا، ئەوە راست نییە!)

- تەواوی زنجیرەی ئەو بیرۆکانە دڵ و دەروونیان داگیر کرد؛ زیندان دووبارە نزیک بووەوە رۆژان و شەوانی کۆت و بەند، ئەم هەموو لێپرسینەوەو هەولانەی کۆلۆنێل دابووی بۆ قەناعەت پێ هێنانی.

- (ئەی ئەگەر جارێکیان لەسەر لێواری خیانەت بوویت؟)

پێڤستۆڤ دەستی بە لەخۆپرسین و خۆدواندن کرد. (ناهەرگیز)... (ئەگەر جارێک بیرت لەخیانەت کردەوە؟).... (بیرم کەوتەوە.. جارێکیان... هەموویان خیانەتیان لەگەڵدا کردم! هەرگیز غەدرم لەکەس نەکردووە، بەڵام جارێکیان... بەڵێ جارێکیان بەبیرمدا هات...).

- (تۆ جاسوسیت)

- (نا ئەوە راست نییە).

- (چ شتێک بکەیت، چ بەبیرتا بێت هەر هەمان شتە، تۆ جاسوسیت).

- پێڤستۆڤ چاوەکانی داخست و بەشەرمەوە هەڵسایەوە سەرەوەی مێزەکەو باخچەکەی تیۆخۆڤی جێهێشت. گەڕایەو بۆ ماڵ بێ ئەوەی ئاوڕ لەدوای خۆی بداتەوە.

- ماوەیەکی زۆر لەدەرگای دا، بەڵام بێ سوود. لەدواییدا پیرەژنی خەواڵوو هاتە دەر

بەرۆیێکی گەورەی نووستن کەکاتی خۆی فیدیۆشا بەهۆیەوە لەناگرەکە دەربازی کردبـوو پـیرەژن دەرگای کردەوە.

ـ (هەها! . . . ، لەدەست ئێـوە نارامـان لێ هـەڵگیراوە ، هـەم لـێرەو هـەم لـەدنیای دیکەشدا) پیرەژن بەم جۆرە سکالای کرد.

ـ پێڤستۆڤ بەسەر نووکی پەنجـەکانی بـەرەو ژوور هەڵکشـاو چاکەتەکـەی لەسـەر عەردەکـە راخست و پاڵکەوت ، تەنها بۆئەوەی سەرخەوێک بشکێنێ.

## (بەشی سێیەم)

لەرۆژێکی خۆشدا هەموو شتێک لەم ماڵەدا هەڵگێردرابووەوە. داپـیرە رۆیشـت ، داپـیرەی چی دی لەماڵ نەماو کەسیش نەما چی دیکە لەسەر شتی پروپووچ پرتەو بۆڵەی بێت.

ـ ژیانی راستەقینە دەستی پێکرد.

ـ تیۆخۆڤ بۆ ئێوارە چەند مێوانێکی هەبوو.

ـ دەتتوانی تا بەیانی بمێنیەوە کەسیش نەیدەگوت پشتی چاوت برۆیـە ، هەڵبـەت میوانـەکان تابەیانی مانەوەو مەست بووەکانیش بەریزە کەوتبوونە سەر یەک و خەوتبوون.

ـ بێگومان ئەوەی ئەو شەوە وەکو تەختی نووستن بەکار هـاتبوو پـاڵتۆ نـەبوو بـەڵکو دۆشـەکە تووک و نەرمەکەی داپیرە بوو. قۆدکاش لەوە نەدەچوو دوایی بێت.

ـ لەهەموو ئـەو هێلکانـەی داپـیرە بـۆ زسـتان هـەڵیگرتبوون تـەنها توێکڵـەکان مـابوون و لەگۆشەیەک هاوێژرابوون.

ـ گەلێک سێویشیان قرتاندو داکرماند وەک مەزە لەگەڵ قۆدکا.

ـ دوای نیـوەڕۆ ژیـانێکی خـۆش دەسـتی پێکـرد. لەخـەو هەڵسـان و چایـان خـواردەوە بـەڵام نانیان نەخوارد ، یەکێکی دی گەیشت. بەزمەکە لێرەدا دەستی پێکرد.

ـ پێڤستۆڤ بارودۆخەکەی بەدڵ بوو. ئەو رۆژە قێزەوەنانەش هاورێ لەگـەڵ مەسـتیو هێڵنـج و دەنگی ناسازو گیانەلای لێپرسینەوەی زینداندا بەرەو ئاوابوون دەچوون.

ـ ئالێرەدا وێنەیەکی لێڵی ژیانێکیدیکـەی لـەناخیدا هـەڵدەقوولا نـەک وەک ئـەوەی مـاڵی تیۆخۆڤ کە دوچاری ئەو سەرئێشە سەختەت بکات.

ـ (خۆزگە ئەو کێشـەیان دەبڕانـدەوەو بارودۆخەکـە ئێسـتا چەشـنێکی دیکـە دەبـوو دوای ئـەو بریارە) پێڤستۆڤ ئاوا دڵی خۆی دەدایەوە.

ـ بەم شێوەیە ژیانێکی نوێتر نەک لەوێنەی ئەوەی تیۆخۆڤ لەنزیک بوونەوە دایە.

ـ لەگەڵ ئەمەشدا شتەکان زیاتر هەڵدەگێرانەوەو پێچەوانە دەکرانەوە.

ـ لێکۆڵینەوەکە لەکۆتایی دابوو. خەڵکان بانگ دەکران بۆ لێپرسینەوە تا بەتـەواوی دوایـی پێ بهێنرێت. هەر کاتێک بەندییەک لەکاتی لێپرسینەوەدا خۆ دزینـەوەی نیشـان دابوایـە ئـەوا

کۆلۆنێل بێ هیچ دوودڵی و نارحەتییەک داوای دەکرد کە پێویستی بەپێڤستۆڤ هەیەو کێشەکەش بەمە چارە سەر دەکرا. (پێڤستۆڤ تەواوی راستیەکان دەدرکێنێت)

- پێڤستۆڤ بەدەگمەن ماڵەوەی جێ دەهێشت، گەر بڕۆیشتبا هەڵبەتە بێ مەبەست نەدەبوو. هاورێکانی تەوقەیان لەگەڵی نەدەکردو لەشەقامەکانیشدا خۆیان لێی لادەدا.

- (تۆ لەپۆلیس چەندت دەست دەکەوێ؟) یەکێک لەو خەڵکانەی بۆ لێپرسینەوە لەبارەی مەسەلەکەیەوە بانگ کرابوو ئاوا پرسیاری کرد.

- (شەش روبڵ) پێڤستۆڤ بێ دوودڵی وەڵامی دایەوە.

- کاتێک دەرکرا ئەو شەش روبلەی وەردەگرت. حاڵی حازر یەک (کیوپێک)یش وەرناگرێ باشە بۆ درۆی کرد؟ خۆشی نەیدەزانی. جا ئایا ئەمانیش بەراستیان بوو کە لەبارەی ئەم شەش رۆبلە پرسیاریان کرد؟

- پێڤستۆڤ دەیویست مەسەلەکەان بۆ ئەو خەڵکە لێرەو لەوێ شی بکاتەوە، بەڵام سەری نەگرت بگرە ئەمە پتر سەری لێ شێواند.

- کاتێک ئەو باسەی خۆی دەگێڕایەوە شتەکانی تێکەڵ دەکردو رێگای ون دەکرد، بەڵام پرسیارێکی راست و رەوان قووت دەبووەوە: ئەو جاسوس بوو یان نەء؟

- هەمیشەو داوی خواردنەوەی شەوانە پێڤستۆڤ نەدەخەوت، بەهێمنی دەکەوتە پرسیار لەخۆکردن بەرەقترین و وشکترین زمان وەلێ هیچی لەخۆی شک نەدەبینی.

- بەڵام هەتا لەنێو تاریکی خەوی قووڵیشدا دەنگێک بەکپی دەیچرپاندە گوێی:

(چ شتێک بکەیت چ بەبیرتا بێت هەرهەمان شتن. تۆ جاسووسی)

- هاوکات نامەیەک لەداپیرەوە هات. لەنامەکەدا بۆ ڤیدیۆشای نووسیبوو کە دەبێ ئاگاداری ماڵەکە بێت، چاودێری شتومەکەکان بکات بەتایبەتیش زیوەکان کە لە باوکی بۆی مابووەوە هەروەها دەبێ هەردەم پیاوێکیش لەو هاورێیەی خۆی بێت، هەموو شتێکی لێ دەوەشێتەوە..

- بەڵام ئەو کاتە ڤیدیۆشا ماوەیەکی زۆر بوو خانووەکەی وەک بارمتەی قەرز لەدەستدابوو. پارەشی بۆ زەماوەندەکەی پێویست بوو. ڤیدیۆشا بڕیاری دابوو ژن بهێنێت و ئێستاش کاتی بەرپاکردنی بنیاتنانەوەی جۆراوجۆر بوو.

- بەیانییەک لەگەڵ کازیوەدا دارتاشەکان بەچەکوشەکانیان هەرایەکی زۆریان نایەوە. ماڵ پڕ ببوو لەتەقەو ژاوەژاوی دارپڕینەوە.

- هاورێیەکان لەم نێوەندەداو لەنێو بۆنی خۆشی ئاردە دارەکاندا گیرسابوون و باسی ئەوە دەکرا کەدەبێ هەموو شتێک بیری لێ بکرێتەوەوە رێکبخرێ بۆ زەماوەندەکە.

- باس و خواسی ئەم مەسەلەیە تەواوی کاتەکەی برد.

- (نیوشا)ی چێشت لێنەریش بۆ چاودێری کردنی ماڵ هێنرابوو. نیوشا هەر زوو بوو بە

هاورێ دارتاشەکان.. شەپۆلی بەهوروژمی دوکەڵ هەڵدەستا.
ـ لێرەوە هەموو ئازارو ئەشکەنجەیەک لەرێگەی رۆژووی (دۆرمیشن)ەوە کۆتایی پێهات.
هەر رۆژی دوایی دۆرمیشن فیدیۆشا بەرەو کڵێسایەکی دەوروبەری شار بەرێکەوت بۆ مارە برین، (پێڤستۆڤ)یش هەوڵی دا وەک پیاو ماقولێک بۆ ئەوێ بچێت، بەڵام حاکمەکە رێگەی نەدا.
ـ پێڤستۆڤ بەتەنیا لەماڵەکەی تیۆخۆڤ جێ هێڵرا.
ـ لەلێکدانەوەکانیدا بۆی دەرکەوت کە ئەو ماڵەی تیایدا دەژیت لەخانێکی سەرە رێگا زیاتر هیچ حسێبێکی دیکەی بۆ ناکرێت.
ـ پێڤستۆڤ بریاریدا لەماڵەکەی تیۆخۆڤ بگوازێتەوەو بەئاسانیش ژوورێکی دیکەی دۆزیەوە. قسەوقسەلۆکی جاسوسیەکەی تا دەهات کاریگەرتر دەبوو.
ـ ئای لەدەست ئەم شارۆچکە کۆن و کەلاوانە، چەندە دڵیان خۆشە بەو خەڵکە ئاست نزم و پیس و پۆخڵانە. رەنگە تۆ دز بیت یا فێڵبازێکی کەم وێنە بیت بەڵام ئەوان بەهۆی تۆوە ناکەونە بەندیخانە، هەروەها هەر بەهۆی تۆشەوەیە کە کاڵاو شمەکەکانیان دەستی بەسەردا ناگیرێت لەبەر ئەوەیە کە تۆ رێزێکی زۆرت لێ دەنرێت.
ـ هەرخوا خۆی دەزانێت کەداپیرە گەرایەوە چی روویدا. پیرەژن هەموو شتێکی پشکنی ئەمیان... ئا ئەماوە، چەندانی دی.. ئا بزرن. زیوەکەی وەبیر هاتەوە، بەخێرایی بەرەو دۆلابەکە چوو. قفڵەکە نەمابوو.
ـ (هەر ئەوە) داپیرە هاواری کرد. (مەحکومەکەیە!) دزیی لێ کردووم، کڵاوی لەسەر ناوم: ئەو جەردەیە، تالانچیە قۆڵی بریوم... شەیتان.....

**(بەشی چوارەم)**

لەم باڵەخانە نوێیەداو لە ژوورێکی تاریکی یەک پەنجەرەییدا کەدەیروانیە دوورایی دەرەوە پێڤستۆڤ رۆژانێکی ساردو سڕو تەماویی دووایین ساتەکانی پاییزی بەسەر دەبرد. ژیانێکی نوێ نەبوو بۆ ئەوە. وەک ئەوە وابوو کەتاوێک بوەستێ و تاوێکی دی دەست پێ بکاتەوەو یا وەک گیایەکی تازە گەشە کردوو کە لەگەڵ زەویدا یەکسان کرابێ و دوایی دەست بەسەوز بوون بکاتەوە لەنێو قوڕو باراندا.
ـ پێڤستۆڤ لەخەیاڵی ئەوەدابوو کە بریارێک چاوەروان دەکرێت. دەینێرنە شارێکی دی. بەڵام بۆی دەرکەوت کە ئەو مەسەلانە ئاوا بەئاسانی بریاری لەسەر نادرێت بۆیە دەبوایە تاماوەیەکی درێژتر چاوەروان بووایە.
ـ لەم تەنهاییەدا پێڤستۆڤ بیری لەوە دەکردەوە کە جۆرە کارێک بۆخۆی پەیدا بکات و بەدڵو گیان تێکەڵی بێت. بەڵام خۆی دەخەڵەتاند، جۆرە کارێکی لەو بابەتە لەئارادا نەبوو.

- دەبێ بەهەر نرخێک بێت ئاواتە ون بووەکەی خۆی بدۆزێتەوە، بەتووندیی بیگرێت و بەهەموو هێزێکیەوە پێوەی بلکێت. دەبێ دەست بەو ژیانە بکاتەوە کەپێش کەوتنە بەندیخانە دەیبردە سەر ئەگە ریش نا باڵەکانی بچەمێنێتەوەو ملکەچی ئەو بێدەنگییە ستەمکارە بێت کەهەموو (بەڵێ) یەکی حاشاهەڵنەگرو هەموو (نا) یەکی بەڵگەنەویست دەخاتە ژێر پێیەوە.

- پێڤستۆڤ لەلێوارە خلیسکاوییەکانی دەریاداو لەژێر نمە بارانێکی وردی پاییزیدا رێگای دەبڕی. خانووە تەڕەکان هێندە کلۆڵانە سلاوەکانیان بۆ دەسەندەوە کە بەتەواوی ئاگریان بەردەدایە چاوەکانی.

- لەدرێژەی رۆیشتنی دا بیری لەژیانی ئەو چارە رەشانە دەکردەوە، شوێنی وا بۆ تێک و پێکدان و وێران کردن نەبێ بۆ هیچی دی ناشێت.

بەلآم چ جۆرە ژیانێکی دیکەی بەمێشکدا دەهات کەجێی ئەو درۆیە سپییانە بگرێتەوە. دەیتوانی ناوێکی لێ بنێت؟ دەیتوانی چی پێ بڵێت؟

بڕیارێک هەردەبێ بدرێت، بنێردێتە شارێکی دیو لەوێدا رەنگە بڵێت...

پێڤستۆڤ دەستی پێکرد شتێکی قورس و شێدار کەوتە سەر شانی.

داپیرە تیۆخۆڤا بەنووکی چەترەکەی نەقیزێکی خزاندە پێڤستۆڤ.

- (زیوەکانم بدەرەوە، ئادەی بم دەرەوە هەی دڕندە. نایەڵم بڕۆیت. مـن رێگـام دای، کەوچکە زیوینەکانت دزیوم ئەو کەوچکانەی‌کە لەباوکم بۆم مابووەوە).

پێڤستۆڤ لەبێدەنگیدا بەتەواوی دەهەژا، بەلآم داپیرە بەقیژەو هاوار داوای کەوچکە زیوینەکانی دەکردەوە کە ڤێستۆڤ لێی دزیبوو.

رێبوارەکان پەیتا پەیتا دەوەستان، دەیانڕوانییو لەبەرخۆیانەوە پێدەکەنین

- (چەند کەوچکێکی دزیوە)

بارانە خۆڵاوییە پاییزەکە لەودیو پەنجەرکەەوە دەپرۆشکایە سەر تەختەکان وەک بڵێی چاودێرییو پاسەوانیی بکەن.

پێڤیستۆڤ بەمۆمەکەی شتەکانی هەڵدەدایەوە، جل وبەرگەکانی خۆی داتەکاند، هەمو کون و کەلەبەرێک گەڕا بەدوا کەوچکە زیوینەکانی داپیرەدا.

دەنگێکیش لەسەرەوە بەئەسپایی و بەردەوام دەیگوت:

(بیکەیت یا بەبیرتا بێت هەر هەمان شتە)

١٩٠٣

**سەرچاوە:**

**Anthology of Russian Shotr Stories. Volume 1. p.p (72-81).**

پەخشان

# خووی بەرگ

**رێبوار ئیدریس**

لەو رۆژەوەی بەجێم هێشتووی ،د نیاکەمم لێ شێواوە، سەر بە هیچ کونێیەکدا دەکەم سوو تووی رۆژە شیرینەکانمی تێدا دەدۆزمەوە، کاتژمێرەکەم نزیک بوونەوەی وادەی هیجرانم پێ دەڵێ... ئای جاران چەند هۆگری بوون، بۆ جێژوانی دەبردم و باسی هاتنی تۆی بۆ دەکردم، ئێستا گلێنەم بەسەر بیابانی تۆزاوی شوشەکەیدا، وێڵە بەدووی جێ پێیەکانتدا چەند دڵنیام ناتدۆزمەوە، سەد هێندەش بەدڵنیاییەوە بۆت دەگەڕێم.

**★ ئەمەیە ئەو کۆتاییەی سەرم دەخوا!!**

بەر لەوەی جێت بهێڵم ... قرچەی گەرمای هاوینان کاری تێ نەدەکردم، ئێستا کزەی دووری دەمسووتێنێ... پاییزانیش هێندە هۆگری خشەی گەڵاو جەستەی رووتی درەختان بووم، وامدەزانی بەرزترین چڵی دارم... کەچی ئێستا کە پایز دێ سامناکترین (لێرەوارم)!!!.. بەهارانیش دەبوومە چیاو تاڵی سپی قژی سەرم هەڵدەوری، نە ئازاری تینوێتی و نە لەخەمی وشک هەڵهاتووی جەستەمم دەزانی.. بەڵام ئێستا کە بەهار دێ لەشکرە نازدارەکەی گریان بەبێ دەنگ، پایتەختی زەردەخەنەی لێوم دەگرێ!

**لەبیرت دێ زستانان پێم دەگوتی:**

★ ئەمە وەرزی سەفەر نییە... هەقە گەراجەکان دابخەن و شوفێرەکانیش بەندبکەن!

**پێت دەگوتم:**

ـ نەء... با ماڵەکان بپشکنن و جانتاکانیان لێ بستێنن!!

کەچی لەچلەی بێدەنگی زستانێکدا بەجێم هێشتی.. نە من چوومە گەراج و نە تۆش شوێنی جانتاکەمت پێ دەزانی.

لەو رۆژەوەی بەجێم هێشتووی.. هەموو شتێکم لێ گۆڕاوە، لەهاورێیەتی شەقامەکان تۆراوم و رقم لەپیاسەی ئێواران دەبێتەوە، نە ئاوازێک دەمهەژێنێ و نەئاشنایەتی گۆرانییەکانی جارانم لەبیر ماوە.

ئێستا لێونێک نییە رستەیەکی تۆم بڵێ، نە ئەلف و بای وەک جارانەو نەوشەکانیش ماناکەی ئەو دەبەخشن، ساڵەکان بێ باران و جوانی گوڵن، منی جاران هێمن.. ئێستاکە لە خۆشم توڕەم، بێزار دەبم بەو شتانەی کە پێش وەختان لام پیرۆز بوون، پێدەکەنم بەو یادگارە شیرینانەی کە جاران دەیانگریاندم!!!

**شێخێک دەڵێ:**

**ئەگەر جیهان خوی پیاو نەبێ .**

**جێ هێشتنیش خوی پیاو نییە★**

چ دادگایەک پرسە بۆ مەرگی بێ تاوان دەگرێ، تا مـن و تـۆ فـەرمانێ لـە شـێخ وەرگریـن، بگەڕێینـەوە ئەو ساتانەی یاسا لەدایک نەبوو بوو.

(ئاخ یاسـا... گـەر نـەهاتبای ماچەکانمان شیرنتر بـوون، خۆشەویسـتیمان لـەجیاتی سـەر پـەڕەی کاغەزێکی دڕاو، لەخوێنماندا هەڵمان دەگرت، ئەوسا ئیدی نەکەس شکاتی دەکردو نەبێ تـاوانیش سـزا دەدرا).

بەڵێ لەو رۆژەوەی دوورم لە تۆ نە میوانی ناوەختم خۆش دەوێ و نە دەرگاکەشم دەخەمـە سـەر پشـت بۆ ئەوانەی کە نازانم کەی دێن،.. پێشوازیشم بـیر چۆتـەوە، نـازانم وەکـو جـاران رێز لـەهاتووەکان بگـرم، تەوقە کردنم لێ بووەتە بێگاری و بەزۆر دەستم رادەوەشێنێ، نـە پەنجـەکانم بـاوەش بـۆ پێنووسـەکەم والا دەکەن، نە ئەویش حەز دەکات پێی بنووسن.

لەو رۆژەوەی بەجێم هێشتووی، یەخەی کراسەکەم خوارە

قژم دەڵێی هێلانە بابردەڵەکەی (حاجی لەقلەقەکەی) شاری قەڵایە.

★ **بێنازم...**

هێندەی مـەرقەدە پیرۆزەکەی (خەیری) و پەیکەرەکەی (حاجی) و منداڵی تازە شەهیدێک،بێنازم!

★ **بێنازم ...**

هێنـدەی بێزاری تـازە بـووک و زاوایـەک لـەدەنگی تفـەنگ، دایکێـک لەشـەڕی براکـان، بـاڵدارێک لەداو، موسافرێک لەسەیتەرە، ئازادی لەدادگا.. بێنازم!

★ **پەست و تووڕەم..**

وەک تـووڕە بوونـی ئـەو نیشـتمانەی پڕیـەتی لـەمێخی سـنوور، ئەو کێڵگەیـەی هـەورێک بەسـەریا داناکا، ئەو درەختەی دەستی رەشەباو زریان باڵدارەکانی ئامێزی لەخەو دەکا!... تووڕەم.

ببوورە لێم.. لەو رۆژەوەی بەجێم هێشتووی، فێری گشت ئەو شتانە بـووم کـە نـەمدەزانی فێریـان بم، باسی گشت ئەو شتانە دەکەم کە زمانی باس کردنیانم نەدەزانی، ئـەو خەمـەی کـە لێم هـەڵدەهات ئێسـتا بووەتە هاوڵم، سەرسام مەبە ئەگەر بڵێم (گریان نییە من ئاوازەکەی نەزانم!)

★ **ئەمە سەرەتای کۆتایی ئەو سەردەمەیە، شەوو رۆژو مـانگ و سـاڵمان، لەلەپی دەسـتیدا دەمرێ! بۆیە دەڵێم:**

**ئێستا تەمەنم سووتووی سەر گۆڕی ماڵئاوابوونە**

**چۆن نەکوژێتەوە مۆمی لەدایك بوونێکی نوێ**

**کە ئەو بەتریقەی پێکەنینەوە دایدەگیرساندو**

**لە داوی خۆی، هەر فووی مەرگی لێ دەکرێ!!.**

.....................................................

★ دێڕە شیعرێکی شاعیری نەمر (شێخ حەسیب قەرەداغ)یە.

پەخشان



ئەحمد حوسێنی

بەسۆرانیکردن: هەندرێن

ناوم جانۆیەو

خاڵم ناوی نییە... ناوی نازانم.

ئەم ئێوارەیە لەسەر دەروازەکانی باکوردا چرپەیەکی ئەبەدی دەهۆنێتەوە، بەقوولی لەهزران رۆدەچێ.

ئەزو خشەخشی پژدینەکەی دایکم، خشەخشی درکە زبیەکانی بەهارو تۆرۆسیش هۆگر دەنوێنن.

خاڵم پشتی لە - با - ی قەدەری دەکاو روخساریشی بەرەو فەرهەنگە نیگەرانەکەی کەوشەن وەردەسوڕێنێ، لەمن و لەپەرچەمە جوانکیلەو بەنازەکەی سەر هەنیەم دەڕوانێ.

وەك هەڵۆیەکی کێوی، بەسەرنجە تیژەکانی نێوان هەڵەت و مینەکانی سەر سنوور، تەیەکا. دوکەڵی جگەرەکانی بەرەو هێڵی مینەکان بەر با دەداو هانکە هانکی کاروانەکەی بەسەر ترسی مندا دەڕژا.

ئەم ئێوارەیە بەرەو باکووری مینرێژکراو دەڕۆین و ، لەنکاوێ (غەزالێ)کەی من دەستم دەگرێ و بۆ جۆخینی گوندیم دەرفێنێ.

تۆ نازانی ئێمە بەرەو باکوور، سەرسنوور دەڕۆین؟

- دەزانم.

- چۆن؟

هەرچەند دوکەڵی جگەرەکان بەرەو مینەکان دەکشان،

ئەز زانیم تۆ بەسەفەر چووی.

خۆتان لەچاوی قەدەرێ وەشێرنەوەو لەهەنگاوەکانتان هۆشیار بن. ئاگاتان لەساواکان بێ دەنا سنوور لە دەستتان دەرفێنێ.

دوا جگەرەکانتان بکێشن و ژنەکانتان ئاگادار بکەنەوە تا تفەنگەکان ئامادە کەن.

خاڵم دەپەیڤی و ددانە زێڕەکەی لەبەر گڵۆپە کزەکانی حەوشەکەماندا دەبریسکایەوە.

ئەم ئێوارەیە بۆ تۆو کوڕەکەت سنوور دەکەمە قوربانی.

- نا براکەم، ئەز ناترسێم.

بەقەیتانی پێڵاوەکانم خۆم مژول دەکەم و نە بیستن دەنوێنم.

لێ بۆ غەزاڵێ لەگەڵمان نایێ؟

چاوە تژ لە ترس و ڕاراکانم دەبڕمە گوڵی دەشتەکە، بەغەڵبە غەڵبی پیاوەکان و زرینگانەوەی خڕخاڵی ژنەکان و ،بەگاز کردنی غەزاڵێ ڕادەبم و لەدایکم نزیکدەبمەوە:

- لەبەرچی غەزاڵێ لەگەڵمان نایێ؟

لەسکەی شەمەندەفەرو، لەمینە بەهێزو بکوژەکان تێدەپەڕن؟ هێستره سێبوورکان بەڕێگا تیژەکانیانەوە بەرەو باڵای تۆرۆسی بڕوادار بەبەڵگەکان، تارمایی پیاوەکان و ،ئەو ئارەزووانەی کە دەستهەڵدێنن لەبەردەم شکۆفە کردنی غونچەکانی ترس، ئەو غونچانەی کەبەسەر خوێنی مندا زاڵبوون، ڕێگا دەبڕن.

بڕوام بەخۆم و بەپێڵاوەکانم نەدەکرد، ئێمە فێری لەرزین بووین لەبەردەم مینەکان، موچرکی شەفاو تای جەستەیەکی شلك، شکانی پووشی هاوین و ،گوڵی خڕنووکی دەشت، چڵەزووهاکان، زمانی وشك، گۆرەوییە تەنکەکان، تۆزوبای گەرم و بەژنی ڕەشی ئەو چکدارە بەڵەدانەی مینەکان، کە لاولاو ئاسا بەسەر ئاسۆی وێرانکراودا هەڵدەشاخان.

- کێ ئاوی دروستکرد؟

بۆ ڕەنگ و ڕوخساری ئەڤینی چیاییم دەگەڕێمەوە، بۆ تاریکی کەواکەی دایکم دەزڤڕمەوەو، غەزاڵێ خۆشم وەك بادەمێکی تەڕ لە یادەوەریم و، لەسەختی گوتنی ناوی ئێستگەکانی تاراوگە حەشار دەدەم.

- کێ ئاوی دروستکرد؟

خاڵم (زەمزەمی) ئاوەکەی لەپێزدێنی دەکاتەوەو ئاوڕ لەمن دەداتەوە:

هۆ کوڕا من، لە ڕۆندکا ئێمە، لە ڕۆندکا ئێمە.

ئەو هەوەڵ ئەسرینەی کەگەیشتە خوڵی زەوی، ئەسرینی دایکاتە بوو. لەگەڵ ڤێ ڕۆندکا جۆگەو ڕووبارەکان لەناخی زامداری شاخەکانی نیشتمان تەقینەوە.

- کەواتە خاڵۆ ئەز لەفرمێسکی دایکا خۆ سۆراغ دەکەم.

رۆژا دوایی لەنزیك جۆخینەكان، غەزالێ مـن گەیشتە سەر شوون پێیەكانی جانۆ، لەدەورەی رۆنیشت و هەموو خۆڵەپۆكی جەم شوون پێیەكانی گلدایەوە، لەدەورەی شوون پێی بچووكی پێلاوەكان شوورەیەكی دروست كرد.

فرمێسكەكان هۆن هۆن چۆڕانەوە، لەجێگەیان گوڵ و گوڵەبەڕۆژە سەوز بوون و بالآیان كرد، روخساریان بەرەو هەتاوە چەقیوەكەی سەر مینەكان وەرچەرخاند.

غەزالێ راڤەیەكی بۆ كات نەدۆزیەوە، دامێنی فستانەكەی گرت و بەرەو ماڵەوە رایكرد، بەمەسینەیەكی پڕ ئاو هاتەوەو بەدوای شوون پێیەكاندا گەڕا، لەكۆتادا نەشوون پێیەكان و ،نە شوورەی خۆڵ و ،نە گوڵەبەڕۆژەكانی دۆزیەوە.

زۆر گەڕا، بەدەم گەڕانەوە ئاو لەمەسینەكەوە دەڕژا. بیست و پێنج ساڵ ئاو لەمەسینەكە تكایەوە، جا لافاوێك هەستاو لەگەڵ لافاوەكەوە فەخفووری و دوا ماوەی سنورو مینەكان و جووتە پێلأوەكەی جانۆش، لێ بەبێ قەمیتان، هەڵزەلین، لەنزیكیانەوە نوشتە سەوسەنییەكەی جانۆ بوو.

- كوانێ جانۆ؟

غەزالێ لەنوشتەكەی پرسی:

بوو بەنێرەكەو، لەقەراغ دەریاچەی (وان) دا باڵندەكان فێری (قاسپە قاسپ) دەكا.

- چۆن قولینگ فێر دەكا؟

- بەرێگەی ئاوەوە، دەڵێن جانۆ دەردی قاسپە قاسپی بۆ دەریاچەكە گواستۆتەوەو، هەر باڵندەیەك ئاوەكەی بخواتەوە دوچاری دەردی قاسپە قاسپی دەبێت.

- ئەی تۆ نوشتە؟

- ئەز نوشتە نیم، پەرەسێلكەم.

ناوم جانۆیە، هەمیشە لەشەقام و كۆڵانەكانی تاراوگە سەرگەردانم و چاوەڕێی نامەكانی غەزالێ دەكەم.

ئەز ناسكم، ترسناكی مینەكان و مەشقكردنەكانی خاڵم بەنەسپە خۆڵەمێشییەكەی لەیادمدا خەزێنە دەكەم هەتا لەگەڵ شوێن،

لەگەڵ كەلاوەو لێكترازان ئاشنا بم، هەتا وێنەی نێرگزو شەو لەدەفتەری تەنیاییدا بكێشم.

هەموو دیوارەكان روخاون، پیاوەكان لەگلی مەزارەكان بێ بەردن، چاودێری خاڵم دەكەم كە راسپاردەو

ئامۆژگارییە یەكلاكانی ئاراستەی مرۆكانی دەكا، وێجا لەمن دەپرسێ:

- تۆ كونجیت خۆشدەوێ؟

دەڵێم كیم و . بەورتە ورت:

- نا خاڵۆ، ئەز غەزالێم خۆشدەوێ.

زەردەخەنەیەك دەگرێ ئەم جارە (ئۆمەر) لە نیوەرۆدا ددانە زێرەکەی دەبریقایەوەو، خەتی سمێڵە باریکەکەشی دەرسکا.

تفەنگەکەی لەشانی دەکاو بەرەو سنوورو مینەکان دەستم دەگرێ:

- ئایا غەزالێ دەبینی؟

دەستم بۆ نوشتەکە درێژ دەکەم، لەجەستەمدا پۆلێك پەرەسێلکە بەرەو بەرزایی هەڵفڕی، کاتێ سەیری خاڵم دەکەم، لەسینگی سنووردا گریان پەنگدەداتەوە.

یەکەم دڵۆپە ڕۆندك هی دایکا من بوو، پەنجەرەی رووحم بەیاد دێتەوە، بەیاد دێتەوە، کەلەبەردەم بیرەوەرییەکان دەستی بەئاوەلابوون کرد. بەسەر گوڵی نوشتەدا دەچەمێمەوەو لەخاڵم دەپرسم:

- کەی لەسەرتاوە لەدایکدەبمەوە؟

خاڵم حەزیدەکرد بگری، لێ نەشدەگریا؟

گوڵە کێوییەکان، گوڵە چکۆلەو رەنگاورەنگەکان بوژانەوە لەبەردەم تەقینەوەی مینەکان، کەلەبەرچاوی ئارەزووی جگەرکێشانی ریناسەکەدا کەمڕ ببوون. گوڵە کێوییەکان بەسەر تەرمە بچووکە هەلاَمساوەکەدا دەنووشتێنەوە، وەك پەیامبەرێك لەقژە هۆنراوەکەی غەزالێ بەنازەوە نهێنی سروە دەگرن.

گوڵە رازی - با - یەکەیان لەزەویدا شاردەوەو تەرمەکەیان لەچاوانی غەزالێدا نواندەوە، جا لەچیەتیو

هۆیەکانی بوونی ئاوو خۆڵ گەڕان

بیستوپێنج ساڵی غەمین بەهاواری دەمبەستراو بەسەر چوون، وێجا جانۆ لەسەرەتاوە بەدەنوك هێلکەی ژیانی تروکاند.

کاتێ بۆ یەکەم جار هاواری کردگوڵە بەرۆژەکان بەسەر مینەکاندا دابارین، خەڵکی چیا لەشوون پێی جانۆ گەڕان، بیستوپێنج ساڵیان تەرخان کرد بۆ گەڕان بەدوای جانۆدا... لەمین و گوڵە کێوییەکانیان پرسیاریانکرد، لێ کەسێك بەیادی دانەهات لەغەزالێ سۆراغێ بکا.

---

★ ئەحمەد حوسێنی: شاعیرو نووسەرێکی کوردستانی سوریایە. زرینگانەوەی ئاوازی شیعرو پەخشانەکانی، دەڵێی سەرابی دەشتی گەرمیانی جزیرەو بۆتانەو لەناو چاوی قاوەیی وەرزەکاندا سەما دەکا. ئەو هاواری شوێن بەزمانێکی زوڵاڵ و بڕشت جەستەبەر دەکا. بەرهەمە چاپکراوەکانی: (بەخەونەوە پێنوسێ دەلۆرینم، ۱۹۹۳ سوێد، وەشانخانەی ژینا نو. ڕۆنۆو سرودێن بێریکرینێ، ۱۹۹٤ ستۆکهۆلم، ژینا نوجەندان بەرهەمی وەرگێڕان لەوانە: (سیرکێ هەسنی)، ۱۹۹۸ سوێد، وەشانخانەی ئاپک، کە پەخشانێکی (سەلیم بەرەکات)ە، دوا بەرهەمی چاپکراوی شاعیرە.

**(هەموو رۆژێ لەتاو هیجرانی ئەمسالْ**
**تەمەننای مردنی پێراره بێ تۆ)**
**نالی**

ئاگره..
ئاگری سالْرۆژی هیجرانەو پرسەی رۆح
ئاگره..
ئاگری دۆزەخی عیشقێکه ئەبەدی
مەدەد دونیا
مەدەد بارانی سەبوریی
مەدەد دەریا
ئاگرێ وەك مەرگ بێ پەروا
بەر بۆته چلْ چلی یادگاری (حەبیبه)و
پەرپەری گولی ئەو قەسیده رۆحیانەی
لەخەونی (نالی)دا بۆ عیشقی وی روا!!
حەبیبەم..
(هەتا تۆم ئاشنا بویت)
وەك هەلْۆ ترۆپکی کۆساران مالْم بوو
وەلێ ئاخ.
لەوەتەی ئاگری هیجرانم له بالاْن بەربووه
ئاسمانم نەدیوه
حەبیبەم..
(هەتا تۆم ئاشنا بویت)
وەکو نەی نەغمەی سۆز زمانی حالْم بوو
وەلێ ئاخ
لەوەتەی زوخاوم لەبرینه کۆنسالاْن دەربووه
سترانی ژووانم نەچریوه
ئاگره..
ئاگری سالْرۆژی هیجرانەو پرسەی رۆح
ئاگره..
ئاگری دۆزەخی عیشقێکه ئەبەدیی.

١٩٩١



**سەعدوللا پەرۆش**

# بیرەوەری ماچ

لێوی گەزۆییم پەرۆشی
لێو ە تە ...نکە
گۆشتنە ماچاویەکانتە
لێوەکانیش تامەزرۆی
لێوی شەکری و هەنگوینمن
کاتێ نوقلی لێوی سەرەوەت
وەکو ئاسکێکی جوانکیلە
وەك راوچیەك بۆ نێچیرێ
دەکەوێتە بۆ ...سە...ی لێوی نەوسناویم
تەزووی شەهوەت لەدەمارم بەجۆش دەبێ
کەکاتێ لێوی ژێرەوەم
دەکەوێتە بەر کە..مێـ...نی
رێـ...ژ...نە...ی ما چ و دەسـ... رێژی راموسانمان و
مژینی دوو لێوە پەنگراویەکانت
تا دوافیشەکی فەنابوون
لەسەنگەر دەمێنێتەوە
ئەو ساتانە
جەنجاڵی گەردون لێواولێو
دەبێتە سێو
لەنێوانی لێوەکانمان
ماچ و
عەتر
و
پەپوولەو
شەونم و
خوناو
ئاوێزانی قەدو باڵای

کەمال رێناس
ئەڵمانیا

# رامان لەهەناسەی بەرد

شەرمین ئەحمەد

کەژاوەی یادە ژان گرتووەکانت
لە ئێستای ئێوارە داگیرساوەکان راهاتوون
دوورگە دوورەکانی مەنفا
سروودی دڵنەواییە وەنەوشییەکانی لەهێکرا
بۆ قەراغەکانی حەسرەت و ئازار راپێچ کرد
ئاسۆی رازەکان چۆن کاڵ دەبنەوە؟!
کە رێکەوت رەنگێکی نەبینراوی تەم گرتوو بێت
ئەم تاراوگەیە چ تاڵاوێکی پێ چەشتیوو
کۆنە هەوارو هێلانەی باڵندە کۆچەریەکان خاپوور کردو
لە شوێنی دا بارگەو هەواری حەسرەتی هەڵدا
چ شەپۆلێکی سەرشێتی نەفرەتی بوو؟
وا بە جارێ کەرنەڤاڵی پڕ جۆش و ترپفەی
زەمەنی سەروەریو جاوایدانی
راماڵی بۆنادیارێکی سەخت
ئاخر چی بوو ئەم لافاوە بەربادەی هێناو
دامیە دەست شەپۆلە دڵ رەقەکانی
ئاخافتنەکان لە شەپۆلە هەڵچووەکان بچووکترن
پەیڤەکان بچووکترن لەمەودای رازەکان
لەناخی شپرزەی کەفرەکان هێند رامام
لەتاسەی باران و
لەهەناسەی بەردو
لەغروری با
تا سیمای هەبوونم گۆپکەی گرت و
لق و پۆپی هانام بەئاسمانا هەڵچوو
ئاخر بۆچی پەیڤەکان بچووکتر بن لەمەودای رازەکان؟
هەمیشە ئێستای ئێوارەکانت داگیرساون
تینوێتیت لەهیچ رێگایەکدا نەوەستا
هەنگاوەکانت بەرەو دوورگە دوورەکانی مەنفای بردم
ئاخر بۆچی پەیڤەکان بچووکترن لەمەودای رازەکان

١٩٩٧

